لە چاپكراوەكانی كۆڕی زانیاری عیراق
«دەستەی كورد»



# بارام ناوێك هەبوو

## كورتە چیرۆك

عەبدوللا سەراج

چاپخانەی كۆڕی زانیاری عیراق
بەغدا - ١٩٨٢

لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری عێراق
«دەستەی کورد»

# بارام ناوێک هەبوو

کورتە چیرۆک

عەبدوڵڵا سەراج

چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق
بەغـدا ـ ١٩٨٢

# مەنجەڵ

**دیوی یەکەم :**

ــ دەمەوێ هەڵبێم‌و ڕوو لە بیابانێکی نەناسراو بکەم ٠
( دلێر درێژەی بە سکاڵاکەی دا ) ٠

٠٠٠ بەڵام ئایا دیلێکی بەندی ئەم ژیانە ، کە لە تاریکیی سکی دایکییەوە بە ڕیخۆڵەیەکی باریکەوە بەسترابێت ٠ لە وزەیدا هەیە هەڵبێت ؟! گومانم زۆرە ٠٠ دیارە ژیانیشم پاشماوەی ئەو دیلییە زگماکییەیە٠٠٠ بۆیە ڕۆژگارم لەگەڵ وەی‌و ناسۆردا لەیەك سەر چاوەوە دێنە خوار ٠٠
(دلێر وەك لەگەڵ کەسێکی نادیار بدوێ چاوی بڕیبووە تەختەکەی بەر خۆی) ٠

٠٠٠ بە هیچ جۆرێك لە پێستی مرۆڤایەتیی خۆم دەرناچم وەك کەسانێك ژیانم ناکەم بە مەرگی باوەشێکی گەرم ٠٠٠ ئەمەش بە ڕاستی بۆتە هۆی کلۆڵی‌و هەوێنی ژانەکانم ٠٠ ئا٠٠ بیرم کەوتەوە ، ڕاستی ٠٠ بەڵێ «ڕاستی» یە برینەکانم دەکولێنێتەوە ٠

( پەتی سکاڵاو کروزانەوەکەی دلێرم پساندو جڵەوی ووتنم گرتە دەست ) ٠

ــ کاك دلێر ، دەزانی ڕەنگی ئاو تا ئێستا لەسەر هیچ تابلۆیەکدا نەزاوە؟!

( دلێر چەند جارێك كاسەی سەری ڕاوەشـاند ؛ وەك لە مەبەستـم نەگات .. بۆیە ووتمەوە ) :

ــ ڕاستی .. كاك دلێر ڕاستی «كەمێك بێدەنگ بووم» ... ئێمە جەزرەبە دراوی ئەم ووشە قەشەنگ‌و تەلیسماوییەین ، هەمیشە بۆتە كێشەی ژیانمان ، بەڵام كاكی خۆم تۆ دوای كڵاوی بابردوو كەوتووی .. «مەلی چاووم لە تەپلی سەرێكی ڕووتی ناو چاپخانەكەدا نیشتەوە» ... بەڵام سەیر ئەوەیە كڵاویش لە ئارادا نییە ! «وا دیار بوو كـە ووشەكانم جێگای خۆیان لە دڵی دلێر دا هەبێت ، بۆیە وەك چەقـۆ ووشەكانم ئاراستە كردەوە» .. ڕاستی .. ووشەیەكە تەنیـا بـۆ ڕازاندنەوەی فەرهەنگەكان دایانهێناوە ، ئەگەر بڕواش ناكەیت ... پێچەوانەكەیم بۆ بسەڵمێنە .. ئەوە من‌و ئەوەش تۆو ژیان‌و ڕۆژگار.. خۆ هەر چاومان بە یەكتر دەكەوێتەوە .

**ئەو دیوی تر :**

لە سووچی چاپخانەكەی پێشوو هەڵتروشكا بووم ، بە چاوێكی وێـڵ دەمڕوانییە لووتی پێڵاوەكانم «گالیسكەیەكی كۆنی یۆنانی ؛ لە بەر چاوی خەیاڵما ، بە تەوژم تێپەڕ بوو . سیرمەی مەچەكی تورە لەسەر پشتی چـوار ئەسپی ڕەسەن ، باڵی دەنەخشاند» دەستێك شانی ڕاسـتمی ڕاژەنـد . لاچاوێكم هەڵبڕی. چەشنی ستوونێكی دێرین دلێر بەتاڵایی جێگیر كردبوو. بەسەر لەقاندنێك هاوبەشیی كردم . «بۆیاغچییەكی منـداڵ ــ تصبـغ ــی بە بۆیە كراوی بە گوێمانا دا ، كە وەڵامی چنگ نەكەوت ، ناچار ڕووی كردە بڕێ سەرباز كە دۆمینەیان دەكرد» پرسیارێكی زەردەخەناویم لە دلێر ڕاست كردەوە :

ــ ها .. لەگەڵ (ڕاستی) دا گەیشتی بەچی ؟

دۆزێتەوە ؟

کەمێك ناوچەوانی هەڵگڵۆفت ، وەك بیر بکاتەوە چەند ووشەیەك لـە دەمی کەوتنە خوار :

ــ نا •• ئا ••• ڕاستی ••• جیوەیە •

« نیگارە رەنگاو رەنگەکەی ئیمام عەلی کە هەڵواسرابوو ، سەرنجی ڕاکێشام • وەك جیۆکند بزەیەکی شاراوەی لە چاوما تۆو کرد» •

ــ جا •• کاك دلێر یەکجاری بڵێ ڕاستی مارمێلکەیە ، بە گوێرەی کاتو جێگا رەنگەکان ئاڵوگۆڕ دەکات !! باشتر نییە ؟!

دلێر جگەرەیەکی لە لا لێوی چەقاندو لە قوڵایی بیرکردنەوەدا دەنگی ووتی :

ــ ئەی !

(ئەی) یەکەیم بەم ڕستەیەوە گرێ دا :

ــ ڕاستی لای من مەنجەڵە • مەنجەڵێکی گەورەیە • لەوانەی ساوەری تیا جۆش دەدەن ، کە سەر قاپەکەی هەڵبدەیتەوە ••• مەنجەڵێـــکی بچووکتر دەبینی • کە ئەویش لابەیت مەنجەڵێکی لەو بچووکـــتری تێدایە ، کە ئەویش هەڵبدەیتەوە ، مەنجەڵێکی ترت بەر چاو دەکەوێ•• بەم جۆرە مەنجەڵەکان دەترەکێنو دەزێن •• هەتا دەگەیتە مەنجەڵێکی ئێجگار بچکۆلانەی بەقەد ئەنگوستیلەی دروومان •• کە ئەویـــش هەڵبدەیتەوە ، تەنیا نەختێك خۆڵ دەبینیو هیچیتر •

دلێر بە دڵنیاییەکەوە هاتە وەڵام :

ــ کەواتە هەر دەبێ لێی عەوداڵ بین • یانیش وەك خـــۆت دەڵێیـــت : سەرقاپەکان هەڵبدەینەوە هەر چەنـــدەش ئەوە دەزانـــم کە ڕاســـتی

یاقووتێکی ئاڵە .. دەستاری پەیوەندیی نێوان خەڵك کردوویە بە تۆزو گەرد ، بەڵام لەوانەیە هاراوەی یاقووتم چنگ بکەوێت .

چاووم بڕیبووە دەمی دلێر . لە ناخما پرسیارێك خولی دەخواردەوە : چۆن ئەو دلێرە بەزیوە بوو بەم دلێرە نەبەزە ؟ بەڵام بناقاقای ئەو پرسیارە ساویلکەیەم تاساند . دەنگی رادیۆ زلەکەی چایخانەکە دانیشتووانی کپ کرد : [تجدد القتال فی فیتنام] . بە تەوسێکەوە ووتم :

ـ باشە تۆ دەربارەی ڕاستی لە هەڵوێستی خۆت بمێنەوە .. لە گەردی یاقووت بگەڕێ (بە پێکەنینەوە) .. ئەگەر دۆزیتەوە برای خۆت بێبەش مەکە ..

لە کۆتایی شەقامەکەدا ، لەیەك دابڕاین . دلێر بۆ پشکنینو منیش بۆ تەنیایی خۆم .

تێبینییەك :

لەو ساکەوە چاومان بە یەکتر نەکەوتووە . کێ دەزانێ .. لەوانەیە نەك تۆزو گەردی یاقووت بگرە ملوانکەیەکی دەست کەوتبێو بۆ خۆی گلی دابێتەوە .

کانوونی یەکەمی ١٩٧٢

# کلیـــل

ناوچەوانە گرژەکەی پەشۆکاویی درکاند • لە عاست دوکانی پێچی کۆڵانەکە هەڵوەستێکی کرد • گیرفانی پشکنی • دوو سێ جـار بە چەقی خۆیدا خولایەوە • زیاتر کۆمایەوەو نیگای بە چەند هێڵێکی نارێکدا سوڕدا • لە دڵی خۆی نەفرەتی لە شارەوانی کرد کە بە تەنگ گەڕەکەکەیانەوە نایەت ، هەر چەندەش بە چەو هەڵڕشتنێك قایلن ، خۆ سەرەڕای چاو پێکەوتن‌و سکاڵا هەڵواسین بە تەنافی رۆژنامەکانا ، هیچ ئەنجامێك نەبوو •

دوو سێ هەنگاوی ناو سڵێـکی کـردەوە ، وەك دڵنیـا بێـت لـە پشکنینەکەی • یەکدوواتێك لە سایەی دوکانەکەدا چەقی بوون ، بەهانایەوە هاتن ، ئەمانیش چاویان دووریيە خۆڵە پەتانەکەی ڕێگاکە • سێ لێرەو چوار لـەوێ ، بـووە قـەرە بـاڵغ • هـەر یـەکە لـە ئـاست خۆیەوە دەگەڕا • هەر بڕێك بیری بۆ شتێك دەچوو ؛ هەندێك لای وا بوو شتێکی بەهادار وون بووە بۆیە بە پەرۆشەوە دەگەڕان بۆ قووت دانی • هەندێکیتر تەنیا خوویەکی مرۆڤانە پاڵی پێوە دەنان بۆ پشکنین ؛ هی واش هەبوو خۆی بۆ خەڵات‌و دەیەك ئامادە دەکرد •

سەرجەم بە یەکا ورووژان ، بە جۆرێك : یەکێك ساتمەی کردو سێ چوارێکیش قۆچیان لە یەکتر دا • بووە شارە زەردەواڵـە بە تایبـەتی کـە منداڵانی گەڕەك خۆیان ئاخنییە پاڵەپەستۆکەوە • بگرە ژنانیش لە درزی

دەرگاکانەوە سەرە تاتکێیان دەکرد • هەر کە ڕێبوارێـك لووتی دەنایـە خەڵکەکە ، دەستو برد دەکەوتە گەڕان بێ ئەوەی بزانێ چی وون بووەو هی کێیە ! ئەوەشی پرسیاری بکردایە وەرامی نابیست ، لەسەر سوڕماتێك بەولاوە کە لە دەستو چاوی خەڵکەکەدا دەڕوا • ناوچەوان گرژەکەش وەك لە تەلبەندی تەلیسما بێت ، قوڕو قەپ بوو • زیقەی هۆڕێك هەموویـانی ڕاچڵەکاند • گشت خزانە یەكو دەرفەتی (خولە) کوێری سەموون فرۆشیان دا بۆ ئەوەی تێپەڕێت • بە یەکا چوونەوە • خولە لە غەڵبـە غـەڵبی ئـەو حەشاماتە واقی وڕما ، کە هۆیەکەی زانی ، دەمی تێکردن :

— پێشینان وتوویانە حەوت جار ماڵی خۆت بگەڕێ ئەوسـا سـەگی دراوسێ بکە بە دز •• با خۆی باش بگەڕێت ••

وەك بەفراوێك بەو کەسانەدا بکرێت ؛ سڕ بوونو بە یـەك دەنـگ وتیـان :

— خۆ واشـە •

ئەوی دوو چاوی هەبوو چواری تری سەلەم کرد • لە سەر خۆ کشانە دوواوە • ئابلۆقەی یەکێکیان دا کە دەستی بۆ باخەڵو گیرفانەکانی دەبردە بێدەنگی دەرگای دەمەکانی کلیلو کلۆم دا ، لە ناکاو دەم نوقاوەکە بـە گەشکەیەکەوە هاواری کرد :

— دۆزیمەوە •

سەرجەم هەناسەیان هەڵکێشاو بازنەکەیان لە دەنگەکە تەنـگ کرد ، بەڵام کە چاویان بە کلیلێکی بچووکی ژەنگاوی کەوت ، وەك شەپا زللە بـە گوێیانا بدرێت ، کردیانە چەخماخە • گەرداوێکی بێزاریو توڕەیی لە هەر لایەکەوە هەڵی کرد •

— ئەم کلیلە ژەنگنەیـە !

ــ بۆ ئەم کلیله بچووکه ئەم حەشاماتەت کۆ کردۆتەوە ؟
ــ باوکم شێتەو گاڵتە بە خەڵك دەکات •

لێوی خواردەوەو نەیزانی بڵێ چی • سەرزەنشتەکان ئێسکی هەستیان کرۆشت ، ناچار زمانی بزواند :

ــ کەی من داوام لێکردن بۆم بپشکنن ؟!
ــ جابۆ کلیلێکی بێ نرخی وا ئەمەندە دەگەڕێیت ، ئەگەر شتێکی تر بووایە چیت دەکرد ؟
ــ لای ئێوە بێ نرخە •• بەڵام لای من گرینگە •• زۆریش گرینگ •• چونکە کلیلی ئەو سنووقەیە کە پیناسی خۆم‌و خێزانەکەمی تێدایە •• کـە •••

پاشکۆی قسەکەیان پێ بڕی‌و دایانە تریقەی پێکەنینێکی ساردو سڕ •

**شوباتی ١٩٧٤**

## پەیــکەر

لە پەنجەرەکەوە خۆر باوێشکی دەداو ئێوارە قالییە سوورەکەی لــە ئاسۆی بەر مالمان ڕادەخست • لەگەڵ دایکی (هەڵۆ) دا لەسەر خوانەکەمان خەریکی شامکردن بووین • بە دەم خواردنەوە سەرنجێکی کڕیارانەم لــە نیگای (شیرین) دەدا کە خەریکی ئێسك هەڵچنین بوو لەو بەشە ماسییــەی (هەڵۆ) • پەرداخێ ئاووم تا سەر هەڵنۆشی • کەمێك ڕاست بوومەوە • لــە پەنجەرەی لای چەپەوە دوو سێ پاساری جریوەیان بوو • بێ ئەوەی هۆیەك هەبێت کشم کرد ، ئەوانیش بۆی هەڵفڕین •

دەمێك بوو ئارەزووی ماسیمان دەکرد ، هەتاکو ئەمــڕۆ جۆرەهــا ماسیی مەبیو بازاڕی داگیر کردو منیش هەر بۆ تاقی کردنەوە خۆم کوتایە ڕیزەوە • سێ ماسیم دەست نیشان کرد ••• هەر یەکەیان لە تیرەو بابەتێك بوو • یەکێکی گەورەو ڕەش ، دیمەنی هەڵواسراوێکی دەخستە یاد کە تازە لە قەنارە درا بێت • ئەوی تر پانو گۆشتن ، پوولەکەی ژێــر ســکی وەك جامەك ڕەنگی دەدایەوە • سێیەمیانیش سوورە ماسییەکی خڕو سەر زل بوو • لە مێشکی خۆمدا ، لە گەڕانەوەدا بەشیانم دەکرد • دوو سێ جار ئالوگۆڕم کردن بە تایبەت لە نێوان ماسییەکەی خۆمو شیرینــدا ، کە گەیشتمە بــەر دەرگای مالەوە ، بڕیارێــك کوتــوپڕ خــۆی سەپــاندە نــاو بازنــەی لێکدانەوەکەم ••• بۆیــە :

ـ شیرین •• هەڵی بێنە چیم لەم کیسەیەدا هێناوەتەوە ؟
ـ ••• !!

هەڵۆ وەك کردبووی بە پیشە ، پەلاماری داو ویستی دەستە بچکۆلانەکانی بخاتە ناو کیسەکەوە . منیش لەبەر ئەوەی نهێنی نەدرکێتەو هەڵۆش لە دیمەنی ئەو ماسییە چاو زیتانە نەتۆقێ ، گورج قورگی کیسەکەم گوشی •

ـ باشە ، زستان کاتێ قەرە خەرمانەکەت لێنا بوو باسی چیمان کرد ، بە تایبەت تۆ ئارەزووی چیت کرد ؟
ـ زانیم •• زانیم •• ماسی ••• نەبێ ؟!
ـ خۆیەتی •• دەی زوو بۆ ئەم ئێوارەیە جێ بە جێیان بکە • ئیتر جۆری ئامادە کردنی خۆت دەیزانی ، بەڵام بڕیارم داوە کە هەرسێکمان لە هەر سێ ماسییەکە بخوێن • گوایە دەڵێن هەر یەکەیان تام‌و چێژێکیان هەیە •

★ ★ ★

بڕیارەکەم هاتە دی • وا ماسییەکان پەرت‌و بڵاو بوونەوەتەوە • ئێسکی سەیرو بڕبڕەی سەرنجکێش کەلەکە بووە•بیر لەوە دەکەمەوە کە پەیکەرێکیان لێدروست بکەم ••بۆ نا ؟ •• جارێك لە مەزادخانە چاووم بە تەزبیحێك کەوت دەنکەکانی لە ئێسکی ماسی بوون • شیرینم لەم بیرەی خۆم بەشدار کرد •

ـ بیستووتە لە ئێسکی ماسی تەزبیح دروست بکرێت ؟
ـ کاکم یەکێکی وای هەبوو ، کوتومت بە ماسی دەچوو هەشت نۆ پارچە بوو •••
ـ نا •• نا •• مەبەستم ئەو جۆرە تەزبیحانە نییە کە لە شێوەی ماسی

دروست کراوون • شیرین ، که دوو دڵیم لای خاوەندەکەی پێوە دیار بوو ، دەست بەجێ چەند جارێك لەناو لەپیا هەڵی گلۆفتو نووساندییە کونە لووتما •• بۆنێکی ساردو سڕ بە مەڵاشووما هەڵگژا ، بۆیە بە سەر لەقاندنێکەوە ملی ڕێگام گرتە بەر •.

دەنگی شیرین ووتی :

ــ بەڵکو ئەو کابرایە تەڵەکە باز بوو بێ ! تۆزێ ڕۆن ماسی‌ی لێداوە بۆ ئەوەی بیفرۆشێت ؟ • بابە خەڵك فێری پێچو پەناو ساختە بوونە • لە پاشان شتێکی سەیرت بۆ دەگێڕمەوە •

ــ نا •• من لەو باوەڕەدانیم • وا بزانم هەر ئێسکی ماسی بوو ، هەر بۆیەش دەمەوێ پەیکەرێك لە پاشماوەی ئەم ماسییانە دروست بکەم•

ڕووی بێدەنگی شیرین هیچی نەدرکاند • هەڵۆ بێ ورتە پارووەکەی دەجوی • ناو بە ناو لە ترسی دەرزیی ئێسکەکان ، دایکی قومێ ئاوی دەنایە دەمی • ئەو ئێوارەیەش ماستاومان نەخواردەوە ! چونکە شیرین لای وا بوو ــ هەر چەندەش کۆشام ئەو بیرە پووچە لە مێشکی دەرپەڕێنم ، بەڵام بێ سوود ــ ماسی‌و ماست بگرە تۆراغو دۆش نەنگو خراپە ، هەر بۆ سەلماندنی ئەم شتە شیرین ووتی :

ــ هاوسێیەکمان •• مەبەستم هاوسێ‌ی ماڵی دایکم ، لە (زێ) وە هەندێ ماسییان بۆ هاتبوو ، ئەوانیش وەك گەشکەی دۆ نەدیو لە بنیان هێناو زۆریش ماستاوو دۆیان بە سەرا کرد • دایکم ووتی ماوەیەکی زۆری نەخایاند کە سەرتاپایان پوولەکە بوو ، سپی هەڵگەڕانو گشت بەڵەك بوون •

بە قاقای پێکەنینێکەوە جڵەوی ووتنم لە شیرین وەرگرت :

ــ کەوا بوو (داروین) ڕاست دەکات •• کە گیاندارو زیندەوەر لە

گۆڕان‌و پێشکەوتن دان •• دیارە دراوسێکەی ماڵی دایکت لە پاشان بوو بێتن بە ماسی یان دەعبایەکی تر !

شیرین بە چاوەکانییەوە دیار بوو کە لە ڕستەی یەکەم نەگەیی بێت ــ (ناهەقی ناگرم چونکە باوکی زوو لە قوتابخانەی دەرهێنا بوو ) ــ بەڵام کە دووا ڕستەی بەر گرێ کەوت وەك سامێك بیگرێت ، لە تۆی چاوێکی زلەوە ڕووانییە من ! بۆیە بە هەلم زانی وەك کرد بووم بە پیشە لە دەرفەتی وا دا شیرین ئاگادار بکەم لە کارو باری هونەرو ژیان‌و زانست ، ئەم جارەش هەر بەو نیازەوە «خۆ ئەگەریش وەری نەگرێت ، بڕوا ناکەم ببێتە کۆسپ‌و تەگەرە لە ڕێگەی خوو ئارەزووەکانمدا ، با لە عاستیا زۆر دڵڕەق نەبم •• زۆری وەرگرتووەو ئێجگار ڕێز لە بێدەنگی‌و ئارەزووەکانم دەگرێت» هەر بۆیە ئەمجارەش کردمە وانەیەك بۆ ئەوەی داروینی پێبناسێنم :

ــ شیرین ، دەزانی داروین کێیە ؟

چاوەڕێی وەڵامم نەکرد (چونکە پرسیاری وا لە ڕاستیدا وەڵامەکەی ئاشکرایە ، بەڵام چار چییە ! هەر دەبێ وا دەست پێبکرێت) ڕاست بوومەوە • ڕووم لە ژووری کتێبەکانم کرد • لە گەڕانەوەدا پەرتووکێکی کراوەم بەدەستەوە بوو کە وێنەی داروینی لێوە دیار بوو ، وەك ئاوێنە ڕیش‌و سمێڵەکەیم خستە بەر چاوی شیرین • ئەویش کەمێك لێی وورد بووەوە • لە پاشان ووتی :

ــ کێیە ؟!

ــ داروێن •• چارلز داروین • زانایەکە ، کاتێکی زۆری لە تەمەنی بۆ زانست‌و لە پێناوی مرۆڤایەتیدا تواندەوە ، ماوەیەك بە گەڕیدەیی شوێن پای گیاندارانی هەڵگرت•شەوانی لەگەڵ کاسەی سەرو جومگی دڕندەو لوولاقی ئاژەڵەکان هەتاکو بەر بەیان ، بە بیر کردنەوەو

لێکۆلینەوەو بەراوورد کردن ••• دەبردە سەر •

شیرین بە سۆزێکی دایکانەوە دەستی بە سەر هەلۆی نووســتوو دا دەهێناو گوێی شل کرد بوو ، بەلام هەستم کرد دەبێ ساکارتر بدوێم بۆیە :

ــ ئەو زانایە دەیویست بزانێ ئێمە چۆن پەیدا بووین ! ئایا لە سەرەتــای بوونمانەوە هەتاکو ئێستاکە هیچ گۆڕانێك لە ئەندامانی لەشمــان نەبووە ؟!

زەردەخەنەیەك ڕووی شیرینی پۆشی • دیار بوو لە شتێك گەیی بێت، بە دوو دلییەکەوە ئەم ووشانەی لە دەم بەر بوودوە :

ــ ئەی نالێن هەموو لە ئادەم‌و حەواین ؟ خوای گەورە لە قوڕ ئــادەمی دروست کردو لە پاشان حەوای لە پەراسووی ئەو دەرهێنا !!

( بۆ ئەوەی یەکسەر گۆمی بڕوای چەند ساڵەی شیرین نەشلەقێنم) بــە شێنەییەکەوە بەر پەرچم دایەوە :

ــ ئاینییەکان وا دەلێن ، بەلام زاناو ڕۆشن بیرەکان لە لایەکی ترەوە بۆی دەچن ، سەرت نەیەشێنم ، داروین پــاش لێکۆلینەوەیــەکی زۆرو سەرنجدان‌و پشکنین دەزانی گەیشتە چی ؟

ــ •••• ؟!

نیشانەی سەر سوڕمانێکی گەورە لە ڕووی شیرینا دەرکەوت •

ــ لە ئەنجامی ئەو هەموو کۆشش‌و تەقەللایەی گەیشتە بڕواکەی دایك‌و نەنکت کە هەیانە لەبارەی پێکەوە خواردنی ماست‌و ماسی •• بەلام، بە شێوەیەکی ئالوگۆڕ ، نەك مرۆڤ ببێتە ماسی‌و پوولەکە دەر بکات، بەلکو من‌و تۆو هەموو خەلکی ئەم جیهانەش ، لە بنەڕەتەوە (مەیموون) بوون •

( له نێوان خۆمانا بێت ، ئەگەر مەسەلەکەم لەوە خەست تر بکردایەو باسی ــ ئەمیبا ــ م بۆ بکردایە ، بێگومان بەشێتی دەزانیم) شیرین واقی ورما .

ــ مەیموون بووین !!

ــ بەڵێ .. مەیموون . بەڵام ئەم شتە وا ئاسان نییە کە بە دەمە تەقێیەکی کورت بۆتی یەك لایی بکەمەوە .. هەستە ، چایەکی خەستم بۆ تێکە.. لە دەرفەتێکی تردا بۆتی ڕوونتر دەکەمەوە ..

شیرین دایکاتە هەڵۆی نایە سەر جێگاکەی خۆیو داپۆشیو چەند جارێك دیم کە وەك بترسێ بە لەپی دەستی ئەم دیوو ئەو دیوی لێفەکەی بە دۆشەکەکەوە توند دەکرد .

« کێ دەزانێ ؟ لەوانە بوو لە دڵیدا لەوە دەترسا نەوەك خێوێك ... شەولەباتێك دەستی لێ بوەشێنێتو قسەکەی داروین بە ئاوەژوویی بێتە دی » .

فڕێکم لە چایەکە داو بۆ ئەوەی باسەکە بگۆڕم ڕووم کردە شیرین :

ــ باش بوو بیرم کەوتەوە ، تۆ ووتت سەر گوزەشتەیەکی سەیرت بۆ دەگێڕمەوە .. دەی فەرموو ..

ــ بە مەرجێك لێم نەگری کە دیسانەوە بڵێم کە لە نەنکمەوە گوێم لێ بووە.

ــ باسەکانی تۆ هەموو لە تەمەنی نەنکتن ! دەی فەرموو ..

ــ نەنکم گێڕایەوە : جارێك جووتیارێك دەچێتە موسڵ بۆ کڕینی گوێدرێژێك . موسڵیش ئەو دەمە ناو بانگی هەبوو لەو بارەوە . جا گوێدرێژی ڕەش ئەوساکە پەسند بووە ، بۆیە ئەو جووتیارە یەکێکی ڕەش دەکڕێتەو بەرەو دووا دەگەڕێتەوە ، کە دەگاتە (کەڵەك یاسین ئاغا ) ڕەهێڵەیەکی توورە دەبێتە تووشی ، هیچ مەلاسێك نابێ خۆی

تێدا بپارێزێت ، که له سواری دادەبەزێت ، دەبینێت گوێدرێژەکەی سپی بۆتەوە ! ترسی لێ دەنیشێ‌و بیر لەوە ناکاتەوە که جامبازە تەڵەك بازەکان فریویان داوە ... لێزمەی باران دەیکوتێ‌و ئەمیش به دەم ڕێگاوە ، بێ ئەوەی ئاوڕ بداتەوە دەڵێت ئاخر زەمانە ، ئاخر زەمان ..

دامه قاقای پێکەنین . له پاشان چاووم بڕییه شیرین . ماندوویی به سەرو سیمایەوە دیار بوو . لەکاتی گێڕانەوەکەشی دا باوێشکی دەدایەوە . هەر وەکو نانە پووەی خوارد بێ پاشکۆی ووشەکانی دەکرۆشت . ووتم :

— شیرین گیان .. ئیتر پێویستیم به تۆ نییه ، ئەگەر دەنویت ئارەزووی خۆتــه ..

وای کرد . منیش ووردە ئێسك‌و بڕبڕەکانم هێنا . ئەم لاو ئەو لا .. وا نا .. واش نا .. له پاش ماوەیەکی زۆر ، به تەلی نەرم پەیکەرێکم لــێ دروست کرد ... ئەوساکە هەستم به حەسانەوەو فرامۆشی کرد . شــار شەوی پۆشیبوو . بێدەنگ خۆم خزاندە ناو جێگاکەمەوە .

مەلا بانگدان ، ڕاست بوومەوە ، بەڵام دڵنیا بووم که ماوەیەکە لەگەڵ خۆمدا دەدوێم‌و وەرا وورد دەکەم . دیمەنی سەیرم دەهاتە پێش چاو ، لەوانە: پیاوە پیرەکەی (ئەرنست هەمنگوای) کــه بڕبــڕەی پشتی نەهــەنگەکەی ڕادەکێشایە سەر ڕۆخی دەریاکە . سەرنجم له پەیکەرەکەی خۆم داو ڕاستەو خۆ پرسیارێکم لێ قوت بووەوە «ناوی ئەم پەیکەرە بنێم چی ؟ » هەر بــه تەوژمی ئەو پرسیارە ووشەی «دەریا» سەرەتای وەڵامێکی بۆ خۆی زەوت کرد ، بــەڵام له هەمـــان کاتدا پرسیارە که زایی‌و پرسیارێکی تری هاویشتە گۆڕ ئەویش : «دەریای چی ؟ » ئەم سەرو ئەو سەری نەخشەی گیتیــم هێنایە بەر تۆڕی چاووم «دەریای سپی ... سوور ... ڕەش» هیچیانم به

دڵ نەبوو ، چونکە دەریایەکم دەویست ناوی لێ نەنرابێت ... بۆیە بە ناچاری ناووم نا «دەریای ماسی» هەر چەندەش لە دەروونەوە قایل نیم بەو ناوو نیشانە چونکە ئاشکرایە کە دەریا هی هیچ کەس نییە لە ماسی بەولاوە بەڵام دیسانەوە چار چییە ؟!

**مارتی ١٩٧٣**

# سەیران

( ١ )

لە سەر شەقامە قیرتاوکراوەکەدا هەر یەکەمان گوڕی دەدایە خۆی • کە گەیشتینە هەورازی پردە تەنگەبەرەکەی نزیك بەنزینخانەکە ، هەناسە بڕکێمان بوو • ماڵی قازی دەیڕوانییە ئاشە کۆنەکەی (کۆشکلی) •

— ئێوە سەرنجی ئەو ژاڵە سپییە بدەن !

— ئەی عارەبانەی ئەو نەوت فرۆشانە !! بۆ هەر بە سەوز بۆیە دەکرێن و حاجی لەقلەقەکەش بە سپی ؟!

پاڵمان دابووە جۆگە ئاسنینەکەی پردەکە •

— منداڵان لە جیاتی پردەکە ، بە ناو ئەو جۆگا ئاسنینەوە دەپەڕینەوە •

— بۆ ئێمەش حەز بەوە ناکەین !؟

— ئەوسا قازییان بەشێت زانی !!

شەش چاوی کراوە دیمەنەکانیان دەقۆزتەوە ، منیش گلێنەی چاووم بڕیبە چوار پاسکیل کە خاوەندەکانیان نیازی سەیرانێکیان هەبوو •

١ — پاسکیلێکی زەردی کاڵ ، بە هەموو پێویستیەکەوە •

٢ — پاسکیلێکی ڕەشباوی نیوداشت ، کە پاش سەرنج و وورد بوونەوە، گومانت ناما کە پێشان سوور بووەو پەڕەمووچێکی نەزان ڕەنگی قیرتاوەکەی پێ بەخشیوە •

٣ ــ ئەمەیان سوورێکی ئاڵ بوو ، هەر چەندەش سێ پایەکەی هی پاسکیلێکی دیکە بوو •

بەڵام چوارەم ، رەنگێکی تایبەتی نەبوو ، چونکە لە ڕاستیدا پاشماوەی چەندین بۆیەی پێوە لکابوو • بێجگە لەوەی کە لە زۆر لاشەوە پەڵەی ژەنگی پێوە دەبیندرا •

شۆڕ بووینە خوارەوە • سێبەری منارەی ئاشە رووخاوەکە لە ڕووی هەر چوارماندا رەنگی دایەوە • کلاو رۆشنەکەی وەکو شوێنەوارێکی دێرین بە ڕووی چەمی (خاسە)دا خێسەی دەکرد • ساڵانی پێشوو لە هەمان کلاو ڕۆشنەوە دەنگی ئاشەوانەکە دەگەیشتە قەراخ شارو ئاش بەتاڵی بە خانووە قوڕەکانی (زێویە) ڕادەگەیاند • باراش دەکەوتە ڕێ • مزەئاشیش بە جووتە مست دەسەندرا • هێڵی شەمەندەفەرەکە گەرووی جۆگەکەی خوارێنی دەتاساندو لەو لاوە بۆی دەرباز دەبوو • ئێمەش ناچار پاسکیلەکانمان دایە کۆڵو ڕچە ریگاکەی ئەو دیوی هێڵە ئاسنینەکەمان گرت• بڕێ شارەمێروولە وەك بە ئەنقەست لەو توولە ڕێیەدا ڕووا بوون ! قەرسیلێکی گەش لای چەپی جۆگەکەی سەوز کرد بوو • (جاران هەمان جۆگا بە قەیاسەی بالایەك زیاتر لە سەروو ترە دەکشاو لە زارکی ئەو ئاشەدا وون دەبوو ) •

لای ڕاستەوە : بەستێکی بەرین بوو • هەر لە نێوان ئەو بەستەو هێڵە ئاسنینەکەدا ، سەوزاییەکی خۆڕسك جۆرە هێمنییەکی دەهاویشتە چاوو دڵەوە •• گیاو گژێکی جۆراو جۆر ، بە دەیان پلەی رەنگی سەوز ، لە ڕوو بەری ئاوەکەدا مەلەیان دەکرد ، بە تایبەت ترشۆکەو پونگەو کوزەڵە پانایی جۆگەلەکەیان لە چاوی ئاسایی دەشاردەوە • تیشکی خۆر بە هۆی چەند قاقلە جنۆکەو گوێچکە ماسییەوە ڕاستەو خۆ لە تۆڕی چاو دەچەقی •

ـ رەشە ‥ ئەم نەرمە بایە زەلی نـاو قـەوزەکانی هێناوەتـە لـەرزەو ئاخاوتن‌و لەنجە ٠ !

ـ تۆ سەرنجی ئەو زەوییە بدە کەوا بە هۆی چالاکی‌ی ئەم مێروولانەوە، لە رەنگی پارچە زەوییەکانی دەورو پشتی ناچێت !!

ئەو مێروولانە بەوە دەچوو کە ڕاهـاتبن بـە شـاورە ڤیژنـەکەی شەمەندەفەرەکە ، هاتو چۆی شەمەندەفەرەکەش خۆی لە خۆیدا بوو بوەوە هەوێنی سەیران‌و رابواردنی مندالآنی ئەو گوزەرە ٠ «کە مندالّ بووم ٠ فلسێکی سوورم لە سەر هێلّەکە دادەناو لە پاش تێپەر بوونی واگۆنەکان دەبووە دوو فلسی !! جار هەبوو لای کوێرەکەی سەرگەی کۆلآنەکەمان شەکرۆکەمان پێدەکڕی » ٠

باش وایە بەدەم ڕێگاوە ، خۆم‌و سێ پاسکیل سوارەکانتـان پـێ بناسێنم ٠ ناووم شێرکۆیە ٠ تەمەنم بیست‌و حەوت سالّی ڕەبەقە ٠ هەمیشە تامەزرۆی گەشت‌و ڕاوە ماسی‌و بینینی شوێنەواری کۆن‌و ئەشکەوتەکانم٠ پارەکە چووم بۆ بینینی هەزامـێردو زەرزی ٠ بـە قاسپـەی کەو دلّـم دەگەشێتەوە ٠ جووتێ کەووم هەیە ، لەو بڕوایە شدام کە ئازادیی ئـەو بالّندانەم زەوت کردووە ٠

**عـادل :**

پاسکیلە سوورەکە هی منە ٠ بە تەمەن لە هەموویان گەورەترم ٠ وەکو شێرکۆ خولیای گەشت‌و سەیران نیم ، ئەو بە زۆرە ملێ تووشی کردووم ٠ حەز بە پیاسەی ئێواران دەکەم ، بە تایبەتی کە خۆر خۆی دەخزێنێتە ئـەو دیوی ئاسۆ ، دیمەنێکی دلفڕین دەکێشێ‌و سێبەرێکی پرتەقالّی بـە سـەر هەموو شتێکا دەکشێت ، شەوانیش خۆم بە فلیمی (کاوبۆی) یەوە خەریك دەکەم ٠ بڕێ کۆترم هەیەو بەلاّم لە ترسی بەدناوی هەلّیان نافڕێنم ٠ لـە

بارەی تەمەنمەوە ، هاورێکانم دەڵێن گوایە سیو شەش نابم !

**رەشید :**

رەشەم بە سەردا بڕاوە • لە دەخوێنمەوەو نە شاتۆ دەبێنم • تەنیا مانگی جارێك بۆ ڕاوە سوێسکە لە شار دەردەچم • سوێسکەکەی من وەکو دانە خۆرە سوێسکە کێوی خڕ دەکاتەوەو ئەوساش بە پەلە پیتکەیەکی ساچمەکەم قڕیان تێدەخەم • دەڵێن تەمەنم پێوە دیار نییە ! جاران دەستی نیگارکێشیم هەبوو ، زۆر لەگەڵ رەنگدا شونـاسیم پەیدا کردو گەیشتمە ئەنجامێك کە ئەگەر دوو رەنگ ، رەنگێکی نوێ دروست بکەن خۆ لە تێکەڵ کردنی گشت ڕەنگەکان رەشێکی ئەو تۆ دێتە کایە کە دەق بە رەنگی پاسکیلەکەم بکات •

**وریـا :**

بە تەمەن لە هەر سێکیان بچووکترم ، لە بەر ئەوەی زۆر جار ووشەی (بریا) بە زارما دێت ، پێم دەڵێن (کاك بریا) • من بە پێچەوانەی ڕەشەوە ، لەو بڕوایە دام کە رەنگەکانی پەلکەزێرینە رەنگی سپی پێك دێنن • بەلام رەشو سپی رەنگ نین چونکە بێ لایەنن • پیشان ئارەزووی رمبـازیو جلیتبازیم هەبوو ، بەلام کە گلامو دەستی ڕاستم لە جێ چوو ، ئەو ئارەزووم نەما ، زۆر جار کاك شێرکۆ یادم دەخاتەوە کە هەتا نە گلێی نابی بە سوار چـاك •

( ٢ )

کلاو کوڕەیەك گۆشەی نیگامی گۆڕی • ئاسمان شینێکی ئەوتۆ بوو کە لە فەرهەنگدا نییە •

ـ ئەم (سۆنە گۆلییە) کوێخای نەبوو بەڵام شێخێك کردی بە هی خۆی!!
پەلپینەو تۆڵەکەیەکی تێراو لە سەر شانی گۆمەکەوە ڕووا بوو •

ـ رەشە ، ئەوە بەستەکەی (خدر زیندەیە) لە بیرمە مەلەمان لێ دەکرد !!

ڕەشە بێدەنگیی قووت دابوو • وریا لەو بڕوایەدا بوو کە هیــچ ماسییەك لە گۆمی مەنگی وا دا نابێت ، دیار بوو بەوەی نازانی کە ئاوێــکی بریسکەدار لە تۆپی تاوێرەکانەوە ، خۆی دەگەیاندە گۆمەکەو لەو لاشەوە دیسان بە نهێنی بۆی دەکشاو بەردە چیمەکانی دەڕەنگاند • رەشە لە سەر قوتکەیەکدا هەڵتووتا • کە قولاپو کەرەستەکانم دەرهێنا عادل ووتی :

ـ باشترین شێوەی ماسی گرتن لە گۆمی وا دا ، ئەوەیە کە چاڵێك لــە کەنارەوە دابڕیت بۆ ئەوەی ماسییەکان ڕووی تێکەن ، کە پەنگیــان خواردەوە ، کارمان هاسان دەبێت •

رەشە پشتی لێمان بوو • چەند جارێك دەستی ئاخنییە کیسەیەك ! دووا جار شتێکی هەڵدایە ناو گۆمەکەوە !!

ـ ئەو چی دەکەیت ؟

عادل ووتی : رەشە ئاوڕی نەدایەوە بەڵام بە ژێر لێوەوە هاتە وەڵام :

ـ ماوەیەکی تر بۆتان ڕوون دەبێتەوە کە کێ ماسیگرە !

ماوەکە بە سەر چوو • دەستکەوتمان بەم جۆرە بوو :

عادل سێ چوار ماسیی وردیلانەی گرت کە بۆ خواردن ناشیان • سەرنەکەوتنی خۆی وا پینە کرد :

ـ هەر چەندەش بە کەڵکی خواردن نایەن ، خۆ جوانن •• بۆ سەلامی برامی دەبەمەوە •

پەلاماری قوتویەکی ژنگنی دوشاوی تەماتەی داو ••• بە پێ خاووسی لە ئاوەکە دەرچوو • منیش دە دوازدە ماسیم گرت ، ئەوی ڕاستی بێت یەکدوواتێکیان کەلکی خواردنیان هەبوو ، بۆیە ئەوانەی ترم هەڵدایە ناو گۆمەکەوە • بەلام لە هەمووی سەر سوڕێنتر ، دیمەنی ئەو هەموو ماسییە بوو کە ڕووی ئاوەکەیان داپۆشی !! هەندێکیان لە سەر پشت وەك فێ لێهاتوو مەلەیان دەکرد ، بڕێك هەڵدەبەزینەوە هەر وەك (باڵیێ مەرگی) نجنسکی بخەنەوە یاد • زۆری ناخایاند کە ئەوەی دەجوولا ، دادەمرکایەوە ، یەکێکی تر دەبزوا ، دادەکەسرا •• رووکاری گۆمەکە بووە شانۆیەك مەگەر (دالی) بتوانێ تابلۆیەکی بۆ بکێشێت • ژێر سکیان لە چەشنی گوێزان دەبریسکانەوە • ڕەشە بە قاقای پێکەنینەوە :

— خۆ دیتان ! ژەهر چەند نایابە بۆ ماسی گرتن •• چاووم پەڕییە تەوقی سەرمو نەڕاندم :

— بۆ وات کرد !؟ خوا بتگرێت ••• دڕندەش وای نەکردووە !!!

ووشەی (دڕندە) کاری خۆی بینیو تووڕەییەکەی شاردەوە :

— هەر کەسێ بە شێوەیێو بە بۆ چوونی خۆی ڕاو دەکات •• جا شورەیی نییە دڕندەم پێ دەڵێی !؟

وەلامەکەی زیاتر ئێسکی ناخمی کرۆشت بۆیە :

— بڕوا بکە ئەوەی تۆ کردت ، ڕفتاری مرۆیەکی هەست خاوێن نییە !

ڕووی گۆڕا • هیچی نەووت • ڕووی کردە پاسکیلەکەی • پایدەری لێدا • پاکانی لە مەکوکی جۆلا بە گورتر بوون !! وریا لێم نزیك بووەوە •

— هەڵەی کرد ، بەلام هاوڕێمانە ، جوان نەبوو بە تەنیا بگەڕێتەوە ••

لە دڵی خۆما بڕیارم دا کە منو ئەویان ئیتر نەووتووە •

ـ كاك وريا •• تاوانه •• تاوان •• تۆش •••

رۆژنامەیەکمان کردە خووان•ئاورم دایەوە وریاش ڕوو لە پاسکیلەکەی دەکات • (دیارە تۆش لە بابەتی ڕەشەی) بە خۆمم ووت •

منو عادل نیوە ڕۆژەمان کرد • ئاسمان سامان بوو • قیرو هۆڕی بۆق سیمفۆنیایەکی لە دووا نەهاتووی بۆ بەهارەکە تۆمار دەکرد • لەو گوزەرەدا سوڕانیەوە هەناسەی قوولمان دا • ساپێنمان کرد • بەهار هەر سووچێکی داگیر کردبوو • سەوزیی دەسخورێنکەو قەوزەکانم بە نیگا دەخواردەوە • چەوێکی شۆراوەی ڕەنگین لە ناو خڕەکەدا کەلەکە کرابوو عادل وەك کردبووی بە پیشە ، ئەم ڕووالەتەی کردە بنەمای دەمە تەقەیەك :

ـ کەلەك کردنی ئەم چەوانە زیان بەخشە • لە لایەك دیمەنی خڕەکە دەشێوێنێو لە لایەکی دیکەوە ، دەبێتە هۆی دروست بوونی گۆمو خنکانی منداڵان !!

نەمویست ئەمیشم لە قیس بچێت ، بەڵام کە دوو ڕێیانەکە گەیشتە سەر ئەوەی هەڵبژێریت ••• بە شێنەییەوە ڕووم لە عادل کرد :

ـ کاك عادلی بەڕێز خۆ دەزانیت ئەم چەوە بۆ بنیاد نانی خانووی شارەکەمان دەبەن • بێگومان بنیاد نانیش کارێکی پیرۆزەو لە خنکانی تاکێك مەزنترە • جا •• بۆ منداڵان دێنە ئێرەو ••• بۆ ئەوەی بخنکێن ؟! دیاریشە زۆر بەلەد نیت لە سروشتی ئەم بەستەی خاسەیە• نارەزاییم بە ڕووی عادلەوە بینی •

ـ ••• بەڵێ شارەزا نییت • چونکە لێشاوی بەهاران ئەم چاڵو قۆڵتانە پڕ دەکاتەوە ، ئەوەش بزانە ئەوەی مەلەوان نەبێت دەخنکێ ••
بە تەوسێکەوە هاتە وەڵام :

ــ کاك شێرکۆ خنکاندنیش لای تۆ دیاره فەلسەفەی هەیە !

ــ کاك عادل بە هەڵەدا چوویت ، فەلسەفە لە ئارادا نییە ، خۆ هەر کەس سەربەستە لە دەربڕینی رای خۆی ، جا با بیروڕا ئاڵوگۆڕ بکەین .

قەلەرەشێك ئاسمانی بان سەرمانی شێواندو قیڕاندی .. شتێکم بە دڵا هاتو ووتم :

ــ تۆ هەر شانازی بە بۆچوونی خۆتەوە دەکەیتو گوێ بۆ بەرانبەری خۆت شل ناکەیت ..

ویستی دەم بکاتەوە . منیش بۆ ئەوەی کێشەکە بمەیێنمو وای لێ نەیەت کە ڕوو لە پاسکیلەکەی بکات :

ــ کاك عادل هەر رایەك رێزی خۆی هەیە ..

ــ نا تــۆ ...

ــ نەخێر .. تۆ هەلاجی بە ووشە دەکەیتو دەتەوێ ڕاستی بە ئاوریشمی دەستکرد بشاریتەوە .

وام زانی بەو ووشانە کۆتایی بە مقۆمقۆکەمان دێت ، بە پێچەوانە هەر دوو چاوی عادل سوور هەڵگەڕانو :

ــ تۆ توانج لە هەمــوو کەس دەگریــت ، کاك شــێرکۆ مــن ڕاستــی دەشارمەوەو ...

وەڵامی نەبیست . چووین بەلای شتومەکەکانمانەوە . نیازم وا بوو دڵی بدەمەوە ، بەڵام هەڵوەستەکەم بە چاك نەزانی بۆیە بێ پەروا چاووم لە هەورێکی کەوە بڕی . کە ئاوڕم دایەوە .. دیــم وەك بیەوێ خۆی بگەیێنێتە وریاو رەشە ، بە توندی پایدەر لێدەدات !!

## ( ٣ )

شاوره تیژەکەی شەمەندەفەرەکە ، لەگەڵ زەردەپەڕی ئێوارە دا ؛ لە گێژاوی لێکدانەوەیەکی خەست رایچەڵەکاندم • خـۆم هەڵدایـە سـەر پاسکیلەکەو چاووم بڕییە دووا فارگۆنی شەمەندەفەرەکە کە وەك ئەژدیهایەکی ئەفسانەیی بەرەو شار هروژمی دەکرد • هەر بە دەم پایدەر لێدانەوە ، لـە ژوورەوەمدا ، باری حوشترێك قسەو کێشە پەنگی دەخواردەوە ، بـەڵام ڕستەیەکم بۆ لێواری جۆگاکە دەربڕی •

ـ تەنیایی باشترە لە هاوڕێتیی کەساتێك کە لە نیوە ڕێدا جێت بهێڵێ •

لە هێڵی شەمەندەفەرەکەوە پەڕیمەوە • مانگایەکی خۆماڵی لە تیماری خانووە قوڕەکاندا سەرنجی راکێشام ، کە بە سۆزەوە گووانەکانی بـۆ بێچووەکەی بەڕەڵلا کرد بوو • مێشکم ئەوەی هاویشتە بەر دیدەم کـە رەشەو وریا ، لە پاشانیش عادل ، ئەم دیمەنە دڵگیرەیان بەر چاو کەوتووە !! یان لە بەر توڕەییو هەڵەشەییان هەر لە عاستیا چاویان نووقاندووە !! هـەر چەندەش ڕستەکە لە شێوەی پرسیار دا نەبوو ، بەڵام بەلامەوە ، ئەوساتـە تێنو تەوژمی ملیۆن پرسیاری هەبوو •

**مارتی ١٩٧٣**

# ساله شێت

[ پێشکەشە بە گشت ساله شێتەکان]

ژمارەی هەرزەکارانی گوندەکە هەمیشە لە کەم بوونـەوەدا بوو • دەستەپیـاوان ڕیش‌چەرمووەکـان مامۆتـکی ئـاوایی لە بـاڵەخانەکەی هەڵدێرەکەدا ، گەنم گردو منداڵانیش جۆ بڵاویان لێکرد • لـە لێـواری گوێسەوان‌و درزی چیغەکانەوە خۆیان لە گوێیانـدا کۆ کرد بـووەوە ؛ چاوەنواڕی بڕیاری ئێجگاری بوون • دێوانە ساڵەیش ـ کە بە ساله شێت ناویان دەبرد ـ هەر چەند زەری پێست بوو ، بەڵام برسێتی بەشی خۆی لە لەشیا تەنی بوو • لەو گوزەرە دا لە نێوان ئـەو دوو بەشـە خەڵـکەدا ، ئاوزەنگی‌ی لە چڵە قامیشەکەی خۆی دەناو لە سەر لاکێشە ڕووناکاییەکانی ناو دێدا خەریکی تەراتێن‌و جلیتبازی بوو •

ماوەی جگەرە کێشانێك دەمەکان کلۆم دران •• قوڕو قەپ • لـە ناکاو ، بانگاواز بڵند بووەوە • دەماو دەمیش بڕیارەکە وەکو پەتایەك پەخش بووەوە کە قوربانی دان پێویستە بۆ ئـەوەی ئاوەکەیـان لـە گـەرووی ئەشکەوتەکەوە لێ بەر بەست نەکرێت •

( خۆ ئەوە قەیاسەی دوو مانگە دێراوەکان تینوون‌و ••• دەغڵ‌و دانیش چاوەڕێی بارانەو بێ هوودە !! وا شینکەی یاڵ‌و کانی‌و پاوەنە زنوێرەکان بوونەتە بەژو وشکانی ) هەر کەس لە عاست خۆیەوە ، ناچار مل کەچ بوو!!

بەڵام نیشانەی پرسیارێك لە هەر ڕوویەکدا خۆی نواند •

ــ باشە ئەمجارە کێ دەبێتە قۆچی قوربانی ؟

پرسیارەکە بێ وەڵام بوو سەرپشکی ئاوایی تەڕو وشکی هەڵداو نۆرە کەوتە سەر کوڕە تاقانەکەی پورە خەندانی بێوەژن •

ــ دایکە •• وەختە گیانم هەڵایسێ •• لە دەزگیرانەکەی من بەولاوە کەس نەبوو •

ــ کچم ، نۆرەی هاتۆتە سەر •• خوا کەریمە ••

ئەو شەوە (گوڵەندام) چاوی توڕەی لە ئاسمان نەتروکاندو مانگیش ئاخڵەی دابوو ، ئەو شەوە شەوێکی بێدار بوو لە مێژووی ئاواییـــەکەدا • کەسێك وەنەوزی نەدا • بەیانی : ئەوی دەنکە گەنمێکی ماڵی پاشای خواردبوو بەرەو سەرچاوەی ئاوەکە هەڵگژا • دامێن ئەشکەوتەکە خۆرنەوەزاێـــکی دلارا بوو • هەر دوو ڕەنگی شینو وەنەوشەیی وەك کاربەدەستی زەمانــە بن ، کاری تەلیسماوییان لە چاواندا دەگێڕا •

وردو درشت ، نێرو مــێ ئالانــە یــەكو چاویــان درووە توونــی ئەشکەوتەکەوە بەو نیازەی کە ئەژدیهاکە بهەژێو پەلاماری قوربانی بداتو پاشەلی بڵند بکاتەوە••

ــ دایکە ئەمەت لە مەتەڵەکەدا گێڕایەوە !!

ــ ووس •

هەموو تامەزرۆی بەرەڵلا بوونی چۆڕە ئاوێك بوون •

ماتییەکی ئەفسانەیی دیمەنەکەی لە ئامێز گرت • قەتیسی فرمێسك لە هەر چاوێکدا وەك سکڵ دەدرەوشایەوە ،

ــ دایە •• دایە ، وا دەبزوێ ••

ــ ووس .

ئەژدیهای حەوت سەر نەڕاندی‌و بە تەمـای چڕنـووك دان بـوو . قوربانییەکە هەنگاوێکی نا . ئەژدیهاش جما ، هەنگاوێکی تری نا ، ئەویش دۆزەخی دەمی ئاراستە کرد . ئا لەم کاتـە ناسـکەدا ... پەلێـك بـاڵی کوڕەکەی ڕاکێشاو نەیویست ببێتە پارووی ئەو نەهەنگە . واقیان وڕمـا . تۆقان . (دەبێ ئەم کارە ناپەسندە لە کێ بوەشێتەوە ؟! ) ترسەکەیان پەرەی سەند . شڵەژان‌و گشت بە یەك دەنگ دەمی ئاخاوتنیان لە سالە کرد :

ــ ئەوە بۆ وات کرد ؟!!

چاوەکانی سالە لە چەشنی بۆڵەمڕی گەشاوە ، چورتمەکەی ئاڵۆزتر کرد . خۆی هەڵدایە سەر تاشە بەردێك‌و هاواری کرد :

ــ هەتاکو ئێرەو بەس ..

تارایەکی خەم‌و کەسەری خەڵکەکەی پـۆشی . (مـن گومـان لـە شێتییەکەی سالە دەکەم ! ــ منیش ... ــ منیش .. ) سالەش لە سەرخۆ گزارەی کێشاو ووتی :

ــ ڕاستە ئێوە شێتە شێتەتان بە سەرما دابڕیوە ، بەڵام ئەم کارەی ئێوەش لە کەسی هوشمەندو ئاسایی ناوەشێتەوە . هەتا کەی بۆ لیکە ئاوێك لاوان دەکەن بە بابۆڵەی ئەم ئەژدیهایە ؟ هەتا کەی ؟؟
هەموو زراویان چوو . چەند دەنگێك بەرز بووەوە .

ــ ئەی چی بکەین ... کاری خوایە ..
ــ ئەگەر خۆت لە ئێمە بە هۆشتر دەزانی چارمان بۆ بدۆزەرەوە ..
ــ بابە .. بە گوێی شێت مەکەن ..
ــ سالە هەلاجی بە ئەقڵمانەوە دەکات لەو لاشەوە دەنگێکی دیکە بـە خۆڕایی تێهەڵچوو :

ــ ووتوویانه : قسه له منداڵ یان له شێت ببیه ••

ساله که هەڵماتەکانی چاوی وەکو چاوی سووره ماسیی تەنگاو دەدرەوشانەوە ، ویستی دەم بکاتەوە • دەرفەتیان نەدا • تەکانی دا :

ــ نەخێر له خوواوه نییه •• خۆتان قایلن بە مل کەچیو سستی •• ئێوه ئارەزووی جماتتان نەماوه ، تینی هەژانتان براوه ••

پاش نەختێك بێدەنگی :

ــ باشه دەڵێن چی که لەم گرفته دەربازتان بکەم ؟

زۆربەیان دوو دڵ بوون ، کەچی ووشەکانی وەك لاستیکی ڕاکێشراو بنا گوێیانی چزاند ، ناچار ووتیان :

ــ چۆن ؟ چۆن ! چۆن ؟!

ساله هیچی نەدرکاند ، بەڵام بۆ رۆژی ئاینده داوای کۆڵی داری له هەر کەسێك کرد • له چاوی ئەشکەوتەکەدا کەڵەکه کران •• ویستەکەی سالەیان به دڵی پڕ گومانەوه هێنایه دی • ئێواره که پاژنەی خۆر هەڵخزایه ئەو دیو کەلەوه ، بڵێسەی ئاگر چوو به ئاسمانا • خەڵکی ئاوایی گوێیان له دەنگی ساله بوو که (با) دەدایه بەر بازنەی بیستنیان (ئە •• ئاو ها ••• دەیخنکێنم •• ئە •• ئاوها •• دەیتاسێنم • ) •• هەر پاش ئەوه قاقای پێکەنینی ساله دۆڵاو دۆڵ ، چیاو چیا ، دەنگی دایەوه •• بەیانیش که سۆراخی سالەیان کرد ، ئێستاو ئێستاش نەیانزانی زەوی قووتی دا یان ئاسمان هەڵی لووشی • بۆیه خەڵکەکه هەر ساڵێك یادی دەکەنو ئەشکەوتەکەیانیش به ناوی ئەوەوه ناو ناوه •

۱۹۷٤

# له گازینۆی پەرلەماندا

[ ئاگایی‌و بیر کردنەوە تـامەزرۆی
دەربڕینمـان دەکات . دەربڕینیش
واتـە : گفتو گۆیەکی دلسـۆزانەی
ڕاستەوخۆ ]

— دیسان دامایت ؟!

— ئەی چۆن دانەمێنم !

— کە دەستت دەخەیتە ژێر چەناگەت (ڕۆدان)م وەبیر دێنی •

— بە لای منەوە ژانی بێدەنگی مرۆڤ لەوە دایە کە ئالودەی بیرکردنەوەیە، بە پێچەوانەش ژیان نرخێکی ئەو تۆی نییە •

[ گومەزە نەخشینەکەی حەیدەرخانە ، لە تۆی بلووری گازینۆکەوە ، شەقڵ‌و ڕەنگدانەوەی ئارام‌و مەزنایەتی‌ی مرۆڤی لێ نیشتبوو ] •

— مەبەستم لە پەیکەرەکەی ڕۆدان دەکەیت کە بۆ بیرکاریك تاشیویە •

— ئەو هونەرمەندەش زۆر بە دوویدا عەودال بوو • زۆریش داما ، بۆیە لە ئەنجاما ، پەیکەری داماوێکی تاشی •

— هەیهوو ••• هەیهوو • گریمان گەیشتی • باشە دووایی ؟ وونبووەکەت دۆزییەوە ، ئەو دووای ؟!

— هیچ •

ـ جارێك کوێخا عەلی‌ی (ئاڕوجە) لە بەڕیوە بەری ناوچــەکەی پرسی : کە پلەت بەرز بوو دەبی بە چی ؟ ووتی : قایمقام • ووتی : گەورەتر بوویت ؟ ووتی : موتەسەریف • ووتی : ئیتر ؟ ووتی : وەزیر • کوێخا هەمدیسان ووتییەوە : دووایی ؟ بەڕیوەبەر لە چــەشنی وەزیرێــك بەشێنەیی ووتی : هیچ • کوێخا هەستایە سەرپێ‌و ووتی : قوربــان کەوا بوو من ئێستاکە لە جەنابتان فرە گەورە ترم چونکە ئەو هیچەم کە ئێوە پاش دەردە سەری‌و ئەشکەنجەو تەمەتێك دەیگەنێ •

ـ کویخا لایەکی ساکاری کێشەکەی هەژاندووە •

[ شاگردی گازینۆکە قاوەی تالی دەبەشاندەوە • منیش فڕی خــۆم لە تالاوەکە دا ] •

ـ ئەی چیت نیازە ؟

ـ لە هیچەکەی کوێخاوە دەست پێ بکەم •

ـ لە کێوە ؟

ـ پێشان لە خۆمەوە •

ـ کەوا بوو ئەوە ئاوێنەو بڕوانە خۆت !

ـ چیت لێ بشارمەوە ؛ هەمیشە دەڕوانمە خۆم ؛ ئەوی ڕاستی بێــت هێشتاکەش زۆر لایەن‌و قوژبنی وام هەیە کە بە باشی شارەزای نیم ، نەخوازەلا خەلکی تر !! کە چەندەها ڕووالەتی دەستکردو تەم‌و مژ ، ناوەوەیان دەشارنەوە • ئەی لە عاست ئەو ئاوێنە زەق‌و قوپاوانــەدا چی بکەم کە روخساری شت دەشێوێنن !؟

ـ ئاوێنەی سروشت هەیە • کانیاو و گۆمەکان • بیبیلەی چاوەکان ••

ـ ئەوانەش لێل‌و قەوزەشیان گرتووە •

[ سێ چوار لاوی قژدار لە لامانەوە دایانە قاقای پێکەنین • بە مــن واهات کە باس لە فلیمێکی سێکس بکەن ]

ــ ئەی چارە ؟

ــ پشکنینەو پشکنین ••• سەرەتاش لە خۆمانەوە •

ــ ڕەنگە نەگەیتە ئەو وارگەیەی کە ئاواتی بۆ دەخوازی •

ــ مەرج نییە ــ لەوانەشە هەر نەگەم •

بەلامەوە گرینك هەنگاو نانەکەیە •

[ چەند کەللە سەرێك لە یەك نزیك بوونەوە • لێوێکیش بە ئـاستەم بزووا • لە ناکاو چاوەکان بوونە نیشانەی سەر سوڕمانو پرسەك ] •

ــ زۆرم پێ خۆشە کە لە وەراووردو بیرکردنەوەکانت بەشداری بکەم • بەو کەسە دەکەیت کە بیەوێ تەلە موویەك سەرانسـەر بکاتـە دوو لەتەوە !!

ــ جارێك لەو جارانەی کە ووشە لە ئاستیا دادەمێنێ ، سەرنجی خـۆم دەدا • کەوتمە بارێکەوە کە نازانم ناوی چیی لێ بنێم ! هەستم بـە زەخمێکی تر کرد •• هەستم بە بەر بلاویو مەودایەکی تر کرد •• هەر وەك لە قولاییمدا شتێکی تر بێتە ناو ، وەك خالێك لە دایـك ببێت • وەك لە بازنەی (جێکات) نەبم ، ئە ئاوها ڕۆشناییەك ئاسۆی بینینمی داپۆشیو کانیاوێك لە ژوورەوەمدا تەقییەوە •

ــ واز لەم وڕێنەو کەلکەلەو ئەندێشانە بێنە •

ــ لەو کاتەدا ••• وام هەست کرد کە بەشێك نیم لە ڕۆژگارو سالنامەکان• ئەو تاکە گەلایە نیم بە دەم رووبارێکی تیژ ڕەوەوە •

ــ هەیهوو •• هەیهوو ••

ــ دەمویست بۆ هەر لایەك پـەل بهـاووم • بـۆ هـەر سەرچـاوەیەك بگەڕێمەوە • لە ژێر هەر سایەو سێبەرێـکا تۆبەرەی ئەو درەختـە بخـۆم ••

[ ڕێبوارێکی خۆڵاوی شەقامی ڕەشیدی بە چەند هەنگاوێك سەر بڕی • جانتاکەی دانا • ڕۆژنامەیەکی کڕی •• ] •

— ئەوە خواردت ! گریمان قەپت لە سێوەکە سوورەکە دا !! ئەنجام ؟

— تەواو ••• دەگەمە جێ •

— تۆ بڵێی وا بێت ؟!

[ دەنگە گڕەکەی شاگردەکە ، پیرێکی مێزەر لە سەری بە ئاگا هێنا ، بۆیە بە دوو پەنجە چاوە کزەکانی هەڵگلۆفت ] •

— بێگومان گیاندارو ڕووەك بێ ئاوو هەوا ناژین • واتە ئاوو هەوا بنەمایەکی بە نرخن بۆ مانەوەی زیندەوەر ، کەچی بە چاوێکی سووك دەڕوانینە ئەو دوو شتە ! بە پێچەوانەش ، لە عاست زێڕو پارە دا هەر لەبەر ئەوەی بریسکە دارو کەمن ، گەشکە دەمانگرێت ! ئایا لە ڕاستیدا (ئاوو زێڕ) کامەیان کەڵکی ئاوارەیەکی وێڵو گومڕا دەدەن لە بیاباتێکی بەریندا !؟

— کەوا بوو •••

— هەر ڕاستی ڕێگایە •

— بەڵام (ڕاستی) لای تۆ چییە ؟ پێداویستێکی سروشتییە کە متۆی بووین ؟ ئاوێکە تینوویەتیمان دەشکێنێ ؟ یانیش تەنها ووشەیەکە خۆمان دامان هێناوە بۆ ئەوەی لە ناو توونی هەزار بە هەزاری ئایینو تەمەنی سەربڕاوی کلۆڵمان دا ، چاوشارکێ لە گەڵدا بکەین ؟

— ڕاستی •• ڕاستی •• بەلای منەوە ، بێچووی پێچەوانەکانە ، ئاوێتەی دژەکانە •

— تێ ناگەم ••

[ پێکەنینێکی ساردو سڕ پەردەی گوێمانی لەراندەوە • بۆیاغچییەك

هاتە ژوورەوە • سەرنجی ڕانکە شڕەکەیم دا •• جاران سەوزێکی قەرسیلی بووە ] •

ـ واتە : لە باوەشی ژیانو مردندا / لە نێوان ئاسمانو زەویـدا / لـە دژایەتیی خوواو شەیتاندا / لە تێکەڵاو بوونـی ڕەشو سـپیدا / زەردو مۆر دا / هەر وەهاش لە زۆرانبازیی ورەو بەزیندا / لە دەست لە مل کردنی نێرو مێدا ••• سەر هەڵدێنێ •••

[ تابلۆ ڕەنگینەکەی ئادەمو حەوام هاتە بەر چاو کە لە هۆڵی ئوتێلەکەدا هەڵواسرا بوو ] •

ـ کەوا بوو دەبەستی بە چێژو ئازارەوە •

ـ بەڵێ •• ئەگەریش لە باوەشی گەرمو یان لە ژێر قەمچییەکی تووڕە دا بێت •

ـ باشە •• ڕاستی چۆن لە نێوان دوو پێچەوانەدا دەڕوێت ؟!

ـ ئێمە مانان ـ نێرو مێ ـ هەر یەکەمان بێ ووچـانو هەمیشـە بـۆ نیوەکەی ترمان دەسووڕێینەوە ، بۆ ئەوەی لە کاتێکی کورتدا ، لە ناو بۆتەی چێژو ئازار دا ، (ڕاستی) یەك دروست بکەین •

ـ کەوا بوو ئێمە ڕاستین ! چونکە (تۆ) وی ڕاستیمان ناشت •

ـ بەلکو ڕاستییەکی تەواوین لەو کاتە ناسکانـەدا ، بەڵام لـە ژیـانی ئاساییماندا ، وا نین ، چونکە ڕاستییەکە دەقڵەشێ ، دادەبڕێ ••

ـ باشە هەموو شتێك دوو بەش نییە !

دینارێك دوو نیو نییە ؟ سێوێك دوو لەت نییە !؟

ـ تۆ وا ساکارانە بۆ مەسەلەکە مەچۆ ، گوایە (یەك) دەشێت کە بکرێت بە (دوو) بەشەوە ، ئەوە تەنیا لە سەر کاغەز دەگونجێت ، بەڵام لـە ڕاستیدا وا نییە ، چونکە هەر یەکێك کە دوو کوت کرا لە (یەکایەتی)

دەر دەچێت ، ئەو ساش دوو (نیو)ی پێ دەووترێت • جا بەم پێوەرە ڕاستییەکی (کوتکراو) نییە ، یانیش (نیمچە) ڕاستی ••

[ سەرنجی شەقامەکەم دا • هەنگاوی گورجو لەزگین • شارلستۆنو مینیو شتی تر •• دەنگو هەرا •• بە ڕاستو چەپا •• ببوورە •• ببوورە•• ئاپوورەو غەلبە غەلب •• پیاو •• پیاو •• ژن •• ژن •• ژن •• پیاوو ژن •• منداڵ •• منداڵێکی بۆیاغی •• ڕەنگی قەرسیل ••]

— باشە کامە هێز پاڵ بە کەرتەکانەوە دەنێت بۆ ئەوەی یەك بگرنو ڕاستی دروست بکەن ؟

— دەڵێن : یاسای ژیانە • دەڵێن : سێکسو چێژە • دەڵێن : یەکیەتیی ئازارە • دەڵێن : خوایە • دەڵێنو دەڵێن ••• با هەر واش بمێنێتەوە ، هەتاکو وەڵامی تەواومان چنگ دەکەوێت •

— ئەم هەویرە ئاوی زۆر دەوێ !

— وەکو پێشتر ووتم : مرۆڤ بڕیاری بیرکردنەوەی بەسەر دراوە •

— ••• !؟

— خۆ لە بێدەنگی باشترە ••

[ منداڵێکی جگەرە فرۆش ••• یەکێکی تر ••• درۆزە کەرێك لە هەر دوو شۆستەکەدا چاوەڕوانی پەڕینەوە بوون • بەڵام گومەزە نەخشینەکەی حەیدەرخانە زەردەخەنەیەکی بۆم دەربڕی • منو هاورێکەم چووینە دەرەوەو تێکەڵاوی شەقامەکە بووین ] •

ئابی ١٩٧٤

# لـه

# چاوەڕوانیی ...

# منداڵـدا

[ پێشکەش بە دایکە نەزۆکەکەم بێ ]

شەوی تارێك کوژەکەی ئاسمـانی قووت دابـوو کە پەنجـەرەی باڵەخانەکەی کردەوە . گەردنی بۆ خوارەوە ڕەوانـە کردو ملوانـکەیەکی دەنك گەورەی هەڵواسی . بایەکی فێنك دەرفەتی شەنو کەو کردنی قژێکی پەشۆکاوی بۆ لووا . لە نێوان دوو دار پرتەقاڵەوە چاوی بڕیبە شەقامەکە . یەکدووایێك بەرەو خوار بوونەوەو دەنگیان ئاوا بوو . لاوێکی هەرزەش فیکەی کێشاو چاوی بە لاکێشە ڕووناکەکانی کۆلانەکەدا لکا .

قەیاسەی کە نیسکێکی کلۆك بێتە کوڵ ، چاوی نووقاند ، پاشـان هەناسەیەکی بێدەنگی هەلکێشا . نەیویست لە پەنجەرەکەوە لا کەوێت بۆیە ئەنشکی بە سەر دا داداو چەناگەی پێ ڕاگرت . ئۆتۆمبیلێـك لـە ڕێزە ماڵەکانی ئەو لایانەوە ، لەنگەری بەستو خێزانێکی بریقەداری هەڵڕشت. چاوەکانی بە گوێرەی خڕوکەی زەوی کرانەوە . بڕێ منداڵی وردیلە ڕوویان لە دەرگایەکی شووشە بەندی ڕەنگین کرد . ترپەی دەستە بچکۆلەکانیان گۆمی ئارامی ئەمیان شڵەقاند . سەری دانەواندو چیمەنی باخچەکەی بەدی کرد . لە بەر تیشکی گلۆپە کزەکەدا ، سەوزێکی شەوگارانەی لە چاویـا

ڕوواند •• لە نکاو •• دەنگێك ڕایچڵەکاندو شیرازەی بێدەنگییەکەی شێواند •

ــ وەرە ژوورەوە !

ــ خەوم زڕاوە ••

ــ شەو درەنگەو بەڵکو بەربەیان بەئاگام دێنی •

ــ •••

لە سەر ڕایەخەکەدا ڕاکشا • پرخە پرخی ناو ژوورەکە زیاتر زینەدەکەی تاراند • بیری بۆ هەشت ساڵی پێشوو هەڵگەڕایەوە • ڕۆژگاری وەك یەك هاتە بەر چاو • شەممە لە یەك شەممە ، لە دوو ، لە سێ ، لە پێنج شەممە دەچوو لەو ساتەوەی کە ناچاریان کرد شوو بە هاوتەمەنێکی باوکی بکات •

دەستێکی بە پەرلۆنە پەمەیەکەیدا هێنا • چەند جارێك تلایەوە • لە پاشان بە پێ خاووسی ملی لە ژوورێك نا • چراکەی هەڵکرد • وێنەیەکی هەتیوی لە دیوارەکەوە داگرت • بە کوڵ ماچی کرد • باوەشی لێدا • هەستی بە حەسانەوەیەك کردو ••• دیسانەوە دەنگێکی گڕ ؛ مەلی هەڵنیشتووی ناو چاوی هەڵفڕاند •

ــ ئەوە بۆ لێرە دانیشتووی ؟!

ــ نازانم •

ــ ئەم وێنەیەت بۆ لە کۆشە ؟

ــ نازانم •

ــ دیسانەوە بەزمەکەیە !!

— له خۆت بپرسه ... له پزیشکه‌کانت .

— ئاخر .. !

— ...

ویستی هه‌موو شتێك بڵێت‌و ده‌رکه‌ی کێوه ئاگرینه‌که لا بدات ، به‌ڵام گیانی هه‌ڵچووی له شێوه‌ی هه‌نسك خۆی نواندو له پاشان به کوڵ گریا.. وێنه‌که‌ی ده‌ستیشی له فرمێسك بێ به‌ش نه‌بوو .

**ئه‌یلوولی ١٩٧٤**

# بارام ناوێك هەبوو

**١ ـ قوڕكاری**

ــ من‌و قوڕكارییان نەووتووە ••

پاییزان •• هامشۆ كەران لە بەر قوڕی گیراوە بە ئاسانی هـاتو چۆیان بۆ ناكرێت ، كە بۆ سەربانەكان هەڵدەشێلدرێت •

ــ مەچەك‌و بازووم تامەزرۆی داس‌و هەوچاڕن •

شەوێك پێشتر خۆڵە سوورەكە ئامادە دەكرێت‌و كای بە سەرا ڕۆ دەكەن • ڕۆژی ئاینده ئاوو پای كرێكار دەكەونە كار • شەوێكی تریش هەر بەو شێوەیە دەیهێڵنەوە •

ــ ئێستا لە كوێم ؟ شار ؟ هەر شارێك بە من چی ؟

كرێكاران لە سەر پەیژەیەكی دارین دەوەسـتن‌و دەسـتاو دەست تۆپەڵەی قوڕ دەگاتە دەستی وەستا • ناو بە ناویـش ؛ لـە خـوارەوە ، حەیرانیك یان پارچە لاوكێك ، وەك ڕووبارێكی سازگار بـۆ مـاوەیەكی كورت باوەشێنی دەروون دەكات ، خۆ هۆرەش ••• هەر مەڵێ •

ــ هەر دەگەڕێمەوە •

لەم دووایییەدا بە هۆی گوریس‌و خولخولۆكە ئیشـەكەیان هاسـان كردەوە ، هەر كە سەتڵەكە بە دوو دەمە خاكەناز پڕ بوو ، یەكێك دەكشێتـە

دوواوە ، سەری گوریسەکەشی بە دەستەوە • لە بانەوەش تاکە کرێکارێك دەست دەداتە سەتڵو ئاو بێنەو دەست بشۆ • ئەم کارە هەرچەندە ئەرکی هەندێکی کەم کردەوە ، کەچی دەرگای ژیانی لە هەندێکی تر بەست •

— بەڵێ هەر دەگەڕێمەوە بۆ لای خۆمان •

بارام لە کاتی دەست بەردانی چێشتەنگاو ، بەدەم خواردنەوە ، هەستی خۆی دەردەبڕی • لە ئەنجامدا ، پاش ئەوەی لە بەر سێبەرەکەدا پریاسکەکەی گرمۆلە کرد ، بە ڕوویەکی گەش‌و دەنگێکی لە سەرخۆ ، گزارەی بە ووتەکانی کێشا :

— ئەگەر ئەمڕۆش نەبێ •• سبەی •• دوو سبەی با دە ساڵی تریش بێت•

من بێ دەنگ بووم‌و ئەو جگەرەیەکی (بافرە)ی پێچایەوە • مژێك‌و دووانی لێدا •

— ئای چەند تاڵە ئەو رۆژگارەی کە لە کەس‌و کارت دوور بی •

سەرم بۆ لەقاندو ، ناخم •• دەنگم بەشداریان لە تاسۆرو ژانەکانی کردو (بێدەنگی)یان بە باشترین دەربڕین زانی بۆ کاتێکی ناسکی وا •

— بە سەر بەرزی‌و بێ ترس دەچمەوە •

سەرنجی کوپە ئاوەکەم دا • تك تك دڵۆپەکانی دەدالاندە ناو حوبانەکەی ژێری • ئەم دیمەنە فێنکییەکی بە دەروونم بەخشی •

— شاتووەکە ••• شۆڕە بییەکە دەبێ مابن ؟

هەر خۆشی وەلامی خۆی دایەوە :

— نەشمابن نامی تر لە جێیان دەنێژم •

له کۆتاییدا دەبوایە شتێکم دەربڕیبایە ، ئەگەریش لە خەستی ووشەیەکیش بووایە ، بۆیە پڕ بە دڵ ووتم :

ــ ئافەرین •

## ٢ ــ بەرەو شار

گولیلکەی ڕەنگاو ڕەنگ بە لا قەدی کیسەی توونەوە خۆیان دەنوێنن • کانیش بۆ ڕووی ناسکۆڵەکان بالاّ ڕوواتێکی بێگەردە • لەو نشێوانەدا ، لە هەر لایەك ، کوڵە ، خۆ ئارایشت دانە • سروشت ڕازاوەیە • بارامیش لە پەنای شاتووەکەدا چاوەڕوانە • هەتا بۆی کرا هەناسەی لە خۆ بڕی (وەك لە بۆسەدا بێت بۆ نێچیرێکی لەزگین) پاشان سەرە تاتکێی کرد • تۆزێك سڵەمییەوە • گەڵای شاتووەکە هاوبەشی بارام بوون ، وەك نوستووبن ، جووڵەیان ناهات مەگەر لە ناکاو چریکەی باڵندەیەك نەبێت کە گۆمی ئارامی دەشڵەقاندو دەبووە هەوێنی شڵەژانی بارامو مایەی ئازاری چاوڕوانیو بێ ئۆقرەیی • (دەبێ بێت ؟! ) لە دڵی خۆیا وەراووردی کردو ئەو پرسیارەی قوت کردەوە •• (بڕوا ناکەم ناپاکیم لە گەڵدا بکاتو پەیمان بشکێنێ) سەرتاپا بەسەر هاتی خۆی هەڵسەنگاندو بیری لە داهاتووی کردەوە • بۆ ماوەی جگەرە کێشانێك بیری خستە کار • کە چاوی تروکاندە لە دوورەوە ، ڕەشاییەك هاتە ناو بازنەی چاوی (خۆی بێت ؟ ) قەبارەی ڕەشاییەکە لە گەورە بووندا بوو ، هەموو شتێکی بۆ ڕوون بووەوە • بە هۆی کزە بایەکی نکاوی ئەندامە خڕپنو تەسەلەکانی (خەجە) وەك پەیکەری خوای جوانی دەرکەوتن • هەر چەندەش ڕستێ بازنگی ڕەنگین مەچەکە گۆشتنەکەی ئابڵوقە دابوو ، خزێمو گوارە زێڕینەکانیشی تیشکی خۆریان دەگەڕاندەوە • کەچی بارام لە بارێکی تردا بوو • هەر دوو بێدەنگ چاویان لە یەکتر بڕی •

ــ خەجێ ! ئەوە خۆتی ؟
ــ با بڕۆین •• کاتی دەمە تەقێ نییە •

پڕپۆڵیان نایە بن هەنگڵو خۆزگەی جووتێ باڵیان خواست • هەر دوو هەنگاویان دەکرد بە یەك • لە پاڵ یاڵێکدا ، بۆ دووا جار سەرنجی دێیە خنجیلانەکەیان دا • بارام وەکو سێبەر کشاو شۆڕ بووەوە ، خەجەش شوێن پای کەوت •

## ٣ ــ دابەش کردنی زەوی

ــ ئاوایی •• خەڵکینە ، لە تەك بەردە نوێژی مزگەوت گرد بینەوە •

بانگاوازەکە چەند جارێك بڵند بووەوە • ڕەشو ڕووتێکی زۆر بڕێ کاربەدەستی میرییان ئابڵوقە دا • لەو لاشەوە کرێ پاڵەیەکی تێکسمراوی دەستو بازوو قەوی ، لە داڵەی شۆڕە بییەکەدا ، لە سەر تاشە بەردێــك شانی دا دا بوو • ئەو هەموو ئاپوورەو غەڵبە غەڵبە دەرفــەتی ئــەوەی لێ نەبڕی کە چاوو برۆ ڕەشەکانی بە دەرگایەکی خوار ئاواییەوە هەڵنەواسێت•

ــ رەشیدی مام ئەوڕەحمان •• فەرموو ئەمەش قەواڵەکەت •
ــ خوا پایە دارتان بکات • سوپاس •
ــ ڕەشۆڵی عەولاّ خدر ، فەرموو •
ــ ئەلحەمیلا ، شوکر بووین بە خاوەن زەوی لە سایەی خواو ئێوە •• مەمنوون •• مەمنوون •
ــ فلاّنی کوڕی فیسار ••• فەرموو ••

بەم شێوەیە فەرمووەکان بە سوپــاسو مەمنــوونو ستــایش وەلاّم رانەوە • لە سەرووی ئەمانەوەش ، ڕوویەکی گرژو مۆنو جووتێ چاوی سوور ، دەیڕوانییە خەڵکەکەو لە دڵی خۆیا پیلانو نەخشەی دەکێشا •

ـ بارامی باجی منیج •• فەرموو ، وەرە پێشەوە •• ئەمەیش تاپۆکەی تۆ •

بارام وەکو کێچ ڕاپەڕیو دەستی فەرمانبەرەکەی گوشیو زۆریش سوپاسی دەربڕیو بە لا چاوێکیش سەرنجی ڕووە گرژەکەی دا ، هەر وەکو تەوسی پێ بکاتو بڵێ :

( ئەمە ئەنجامی دەرەبەگیو زۆر دارییە ) •

بارام دووا کەس نەبوو کە زەوی وەربگرێت ، گشت بە دڵی شادەوە، ڕوویان کردە کۆمەڵەی جوتیارانو گوێیان گرت لە ئامۆژگارییو شتی تر ••

## ٤ ـ جوڵانەوەی ڕوو گرژەکە

ـ هەی سەگی •• دایك •• تۆ بۆ ئەوەندە خوێڕیو ترسنۆکیت ؟

ـ ئاخر •• میرم ••

ـ حەرامزادەی بێ فەڕ • دوێنێ خولە سەگێکی لێیان تۆپانو کەسیش نەیووت بەر چاوی بە کلەوەیە !!

ـ دەباشە قوربان باشە ، بەڵام خەڵاتێکی باشم دەوێ •

ـ تۆ ئێستاکە ماڵت بشکێنە ، ئەوساکە هەموو شت بە گوێرەی دڵمان دەبێتو کەواو سەڵتەیەکت بۆ دەکەم ••

قرمەی بڕنۆ بە شەوان دەنگ دەداتەوە ، بە دوو زەردێنەی ناو دەبەن، پەلە پیتکەیەك بزواو لە تاریکاییدا ، تەرمێك لە خڵتەی خوێن گەوزا • بووە سەگوەڕو هەیتو هوتو (بیگرن •• بیگرن •• ) •

ـ نەتانزانی کێ بوو ؟!

ـ ••• !!

ـ ئەی چیی لێهات !؟ زەوی قووتی دا !!

— بگرەو بەردەی ناوێ ، هەر خۆیەتی • لەویش بەولاوە کەسێکی تر ناپاکیی وا ناکات •

مقۆ مقۆ زۆر بوو • هەر بە هەمان شەویش تەرمەکەیان بە خاك سپارد• جارێکی تر ، لاشەی (حەمە سوور) یان لە پارچە زەوییەکەی خنۆی دۆزییەوە ، ئەوەندە گەوزا بوو ، خوێنێکی زۆری بەو گوزەرەدا پرژاندبوو ، بە چوار دەستە ڕاستیان کردەوە • مشتی خۆڵ لەناو لەپە نووقاوەکەیدا ، شێوەی پەنجەکانی وەرگرتبوو ، سەرەڕای ئەوەش قوڕە سوورێکی لینج پێلوو برۆکانی سواخ دابوو •

خولەو جۆری خولە چەند جارێك پەلە پیتکەیان بزواندو هەر جاریش تاوان سەرنگووم بوو !! شین کەوتە ئاوایی • ڕۆژو شەو لە ڕەشاییدا یەکیان گرتەوە • گومانو دوو دڵی کەوتە نێوان •

— وەرن با پێکەوە شتێك بکەین •
— بارام تۆ هێشتا منداڵیو بۆنی شیرت لێ دێ •
— بە گوێم بکەن پاشەگەز نابنەوە •
— بارام گەوج مەبە ، ئەوەی تۆ بیری لێ دەکەیتەوە ماڵوێرانیو دەربەدەریی لە دووایە •
— باشە ، کە زەوییان داینێ باسی وایان نەکرد ؟
— کوڕم ئێمە کەی لە تای ئەوانەین !
— ئارەزووی خۆتانە ••

گیرو گرفتەکەیان هەلاجی کرد بەڵام کە بارام نائومێد بوو دەمی کردەوە :

— وا بزانم هەر ڕێگایەکی تر ، خۆ فریودانو بە هەڵەدا چوونە ••• ئەگەریش بە تەنگی ئێوەو خۆمەوە نەبوومایە ، دەمم کلۆم دەدا •

خەڵکەکە بوونە چەند بەشەوە • لە کۆتاییدا ، بەرەو ماڵ چوون بەو نیازەی «خوا یەکەو دەرگای هەزار» •

ئەو شەوە بارام خەوی لێ تۆرا • گێنگڵی داو شەشو حەوتی بوو • وەك شەریتی سینەما خەڵکەکەی هاتە بەر چاو کە.دەیانووت : «بێدەنگ بە•• لە هەر شتێك خۆت هەڵمەقورتێنە » •

هەزار پایەك لای سەرییەوە وریای کردەوە ، گورج بە پێڵاوە پژەکەی پلیشاندییەوە ، ئیتر هەستی بەوە کرد کە لە وزەیدا نییە بێدەنگ بێتو هەر چیش هەیە بیکێشێتە ژوورەوەی • لەگەڵ مەلا بانگدان ، کەوتە نەخشە کێشانی تایبەتی خۆی ، بە هەر جۆرێك بوو خەجەی کچی (ئۆمەر ئاغا)ی بینیو پەیمانەکەیان ئاڵو گۆڕ کردەوە •

**٥ ـ کۆمەڵەی جووتیاران**

خۆر ئاوابوونێك ڕان گەڕایەوە • شوان بە گاڵۆكو کەپەنكو کڵاو قوتەکەیەوە • مێگەل بە باعە باعو بارە بارەوە • تۆزو گەردیش مەودای بینینی کورت کردەوە • دیمەنێکی دڵفڕێن نەخشـا بۆ کابانـەکان کە لـە جموجۆڵدا بوون • سوختەو فەقێش ڕاستو چەپ «راتب رەحمەتتان لێ بێت» کۆڵانەکانیان تەنی • دەنگی زەنگوڵەی بەرانو تەگەکانیش ئاوازێکی نەمری بەو تابلۆیە بەخشی • هەر کە مەلا فەرمووی «الله اکبر» شام کراو پاش حەسانەوەیەکی کورت ، یەکودوو ، لە هەر لایەکەوە ، ڕوویان کردە کۆمەڵەی جووتیاران • فانووسەکان لە ناوەند جێگیر کرانو پێشەکی باس لە سەپانو ئاودێرو داسو شەغرەو خەنجەرو هەوجاڕ کرا • دەمێك بـە زەردەخەنەوە ئاراستەی بارام بوو :

ـ ئەرێ برا کەی ڕەشبەڵەکمان بۆ دەگێڕیت ؟

— تو خوا ئێستا کاتی زەماوەندو بەزمو شاییە ؟!

دەمەکە قوڕو قەپی کرد • پیرێکی پشت کۆماوە ، لە لاوە چەند جارێك پشمیو لە پاشان ئاخاوت :

— بارام •• هەر وا بووەو هەر واش دەڕوات •

— ڕاستە مام باپیر •• بەڵام هێشتا خوێنەکانیان ووشك نەبۆتەوە ! باشیش دەزانن کە پەنجەی کام ناپاك دەیگیرێت •• ئێوەش داوای شتی وام لێدەکەن !!

— کوڕم ، سوحبەتت لەپاڵدا دەکەین ، ئەگینا لەو بارەدا نیین ••• نەوەڵلا •

مام باپیر پشمییەوە • دەم نووقاوەکە دەرفەتی بۆ ڕەخساو دووا گورزی خۆی وەشاند :

— ئەوی ڕاست بێت کاك بارام •• پسە پسێك لە کۆڕی ژناندا هەیە ••• بارام وەك یەکێك خۆی لە گەمارۆیەکدا بەدی بکات خۆی پێ نەگیرا •

— خوا هەمووتان بێ وەی بکات ، لە قسە بەولاوە هیچی ترتان لە دەست نایەت ، وەك مەلا (شمس‌الدین) ووتەنی قسە ناچێتە گیرفانەوە •

خەڵکەکە دامان • بارامیش لە سەری ڕۆیشت :

— کەر لە کوێ کەوتووەو کوندە لە کوێ دڕاوە !!

گشت دایانە تریقەی پێکەنین • بێ ئەوەی لە مەبەستی تەواوی بارامیش بگەن •

— ئێستا لەوە گەڕێن ••

دەنگێك ووتی •

– باشه کاك بارام ، ڕەوای بە هەقە ئۆمەر ئاغا پێشەکی بەشێکی زۆر بۆ خۆی گل بداتەوەو ئەو دوواشی بۆ ئێمە مانان بێت ؟

– ئەمە وا نابێت .

دەنگێکی تر ووتی . پرسیارەکان بێ وەڵام مانەوە .

– خۆزگە دابەش کردنەکەیان بە من دەسپارد .

– هەرچی بوو بوو ، بارام .. ئێستا چی بکەین ؟

– چی بکەین ؟ وەکو هەموو جارێك ووتوومە ، چارەی هەیە ... بەڵام ...

یەکێك لە گزیرەکانی ئۆمەر ئاغا خۆی بە وێدا کرد . سەریان سوڕماو سەرنجیان لە یەکتر دا .

– بارام ، ئاغا لە دیوەخان .. چاوەڕوانتە .

– باشە ، بەیانی سەری لێدەدەم . ئێستا شەوەو بۆشم ناکرێت ..

جووتیارەکان گومانیان پەیدا کردو ڕوویان بووە نیشانەی پرسەك وەك بڵێن : «دەچێت ؟؟ » بارام بڕیاری خۆی دابوو . بۆیە بێ پەروا هاتە دەست :

– دەی ملت بشکێنەو لە بەر چاومان وون بە ..

– ئاغام فەرمووی ئەم ... شەو ...

– مەیکەرە درێژ دادڕیو بڕۆ بە ئاغات بڵێ نایەت ..

بارام ویستی بڵێت : «بەیانیش هەر نایەم» بەڵام بۆ ئەوەی نەخشەکەی نەشێوێت ، ئەو نیوە وەڵامەی پڕ بە پێست خۆی زانی .

**تەمووزی ١٩٧٥**

## س

له مێژ بوو پەرۆشی ئەوە بووم کە لە نزیکەوە بیناسم • بە کامی دڵ نەگەیشتم بۆیە بە (س) ناو زەدی دەکەم •

— بەم دواییە (ئەز ووتم) وەك سەودا سەرێك تەریكو کەمدوو بوو •
— جارێك (ئەو ووتی) لێم بیست شیزوفرینیای هەیە !

پاش مردنی کەوتمە خولیای ئەوەی کە سەردانیی پزیشکەکانی بکەم، دەرفەتم لە پزیشکە لاوەکە سەندو بە خۆڕایی دوواندم •

— دەیووت نەخۆشییەکی دەروونیم هەیە • ! بەڵام من مەترسیم لە شتێکی دیکە کردو بۆیە ناردمە لای پرسپۆڕێکی هاوڕێم •
سەرسامیم لێ نیشت • ئەو دیسانەوە هەر بە خۆڕایی گزارەی کێشا :
— ••• دەرکەوت ، سییەکانی قرژە بن کنەی تیا کرد بوون • ڕاپۆرتەکە ماوەی دوو مانگی بۆ تەمەنی کێشا بوو !

مەراقم پەرەی سەند (چۆن دەبێ کەسێکی وا بێ سەرو شوێن بچێت) منو دەماوەندو هەندێکی نەناسراو لە سەر تەرمەکەی کەلەکەمان کرد •

ووتم : جا ئەو شوفێرە لە قەنارەش بدرێت خۆ هیچ ناگەیێنێ لای شێرکۆی کوڕی •

(ئەمەیە •• مەرگ •• ! ) بە خۆمم ووت • سەرەکان هاتنە یەك • بازنەیەکیان پێك هێنا • بەو چێشتەنگاوە ئۆتۆمبیلەکان پەنگیان خواردەوە•

( م — ٤ )

(زارکی شەقامەکە ، ئەگەر گەرووی ئەرژەنگیش بووایە ، بێگومان بابۆلەی ئۆتۆمبیلەکان دەیان خنکاند ! ) فیات •• رینۆ •• داتسۆن •• تابلۆیـەکی خوێنین • ڕوو لە هەر جۆرێك : تاشراو / خۆلاوی / قوپاو • دوو پەنجەی یەکێك پێلووی دادایەوە • چاو لە هەر بابەتێك : پرسیاراوی / گوماناوی / خەمگین • (با) خڕۆکەیەکی قورقۆشمینی ڕاوەستاو بوو • دەست لە هەر چەشنێك : قلیشاو / ماندوو / زبر • جغزەکە شـکاو پاسکیل سوارێـك خۆی ئاخنییە درزەکەوە •

ــ ئەوە ریزی چییە ؟

سلەمییەوە •

ــ بۆ شوفێرەکە ناگرن ؟!

ــ لێرە مۆزو پرتەقاڵ نادرێت ••

دەنگێك وەلامی پاسکیل سوارەکەی دایەوە •

تەنافەکان : ڕەنگی بوزگوڕە هەڵخراوەکانیان بە ئاسمان دەفرۆشت •

ئاسمانیش ئەو کاتە لای من دوپشکەو شەوگەردو سیخوڕو گوژالکی دەباراند • خەم دایگرتم • پڕ بە خڕۆکەو جمگەکانم ، مژێکی درێژم لـە جگەرەکەم داو لە بەر خۆمەوە ووتم (ئای مرۆڤ) •

★ ★ ★

کاتژمێرەکەم : سێو هەندێك بوو • زۆر کەس شانیان دەدایە لێواری تابووتەکەو لە عاست خۆیانەوە ، باس و خواسی نیمچە ئاشنایەتییان لە مـەڕ (س)ەوە دەدرکاند • دەماوەند لە سەر بەرەو ژووری گۆڕستانەکەی (شیخ محی‌الدین ) لای شانی ڕاستمەوە بوو •

ــ تۆبەرەکەیان پێنج سالان بوو کە دایکی شێرکۆیان بۆ ئێرە هێنا •

ــ کاك دەماوەند ، وابزانم دەستی نووسینی هەبوو ••

ئاورم دایەوە • شار لە ژێر پێماندا دەکشا «لە تیماری بسفۆر دا ، دوندی شەپۆلەکان ، جۆرەها نیگاری سروشتییان دەنواند • وەك ڕەوە کەروێشکێکی سپیو تۆقاو ، خۆیان لە پێچو پەنای تاوێرەکانـدا مـەلآس دەدا• لە نەخشەی چوار کوتکراوەکەی مێشکمدا، بەندەرێکم نەدۆزییەوە•• دیارە دەنگمان بە کەس ناگات ! هیچ نەبێ خنکاو لە دەریادا دوواپین نامەی خۆی بە شووشەی بەتاڵ دەگەیێنێتە خەڵك ••• ئەم کابرایەش لە پاڵمەوە ، دگانە دەستکردەکانی دەشواتەوە ، قێزم هاتەوە ! هەموو ڕەنجی مرۆڤایەتیو ژیار لە پێناوی بەندەرە •• بەندەری هێمنیو کامەرانیو سەرفرازیش هـەر بەشێکن لە بەندەرە سروشتییەکە ••• »

ــ ژنەکەی سەرەڕای ئاڵۆزیی مێشکی ، کوێریش بوو !!

پەستەك لە شاێك تەکانی داو داری بێشکەی مەرگەکەی لێم ستاند • ژێر پام توێقڵەی کرد بوو «پەستەكو هاوین ! » سەرنجم دا « ڕاهاتنە •• دیارە بەم گەداییەش ڕاهاتووین !! میران دەگۆڕێن •••• ئێمەیش هەر میزی حوشترەکەین • پێستیشم بگروون دەمی خۆم ناگرم • ئێمە قاوەڵتیو نیوە ڕۆژەو شامیش ، هەر بە ئاخاوتن دەکەین ! نەخۆشین / خۆخۆرین / کورت بینین / پوول پەرستین • دەبێ لەم سەدەی بیستەمە دا ، ئێمـە سـەر بە کام قۆنـاغ بین ؟ دەیەمین •• دوانزە مین •• دڵنیام لەوەی کە چواردە مینمـان تێپەڕ نەکردووە » لە ناو خەڵکەکەدا وون بووم • گوێچکەم لەو پەنگاوییـە دا ڕادێرا [ ڕەسەنیی خۆی لە چاوی پتر دەپاراست / هەیە ئەم جێگایەشی بۆ نابێتە ئارامگا / دەیویست هەست بە بێگیانەکانیش بکات / دەتووت بـە سەر هێلکەدا دەڕوات / جـار هەبوو لە سەرانسـەری ڕۆژێکدا چەنـد ووشەیەکی هەڵدەوەراند / حەزی بە ئێش دەکرد / مام رەشیدی چـایچی ووتی کە پیاڵەکە دەستی بڕی ، بە منی ووت تۆ سەرنجی ئەم خوێنە بدە کـە

چەند ئاڵە شایانی ئەوە نییە نیگاری مەم‌و زینی پێ بکێشرێت‌و لەم دیوارە دا هەڵی بواسێت ] •

دەماوەندیش لە ژێر تابووتەکە جێ لەق کرا • ئەوەندەی زانی وا لە تەکمەوە ڕێ دەکات • فاتیحامان بۆ سەر.جەمی مردوو و زیندووەکانمان هەناردو دەماوەند دەمی نایە بن گوێم •

— زۆر جار ووشەی (نرڤانا)ی بەکار دەهێنا ! دەبێ چی بێ ، بە تایبەت کە دەیخواردەوە ، لەوێ پەنجەی لە دانیشتووەکان ڕادەوەشاندو ئەو ووشەیەی دەووت ••• دووایش ••• دەرژایەوە !!

پەنجەم نایە سەر لێوم وەك بەو بڵێم ئێستا کاتی ئەوە نییە • هەرکەس لە سێبەرێك دەگەڕا • هەتاو دیمەنی شتەکانی دەگۆڕییە زمانی سێبەرێکی خەست • من لای تۆپەڵە قوڕە سوورەکانەوە ، لە چەشنی دوو پەڕەسێلکەی کە لە هێلانەیەکی کۆن بگەڕێن ؛ هەر دوو چاووم دیمەن گۆڕکێیان دەکرد ، لە شێرکۆ دەگەڕان • تەمەنیم بە هەشت‌و تۆ قەرەساند •

— شێرکۆ گیان ، باوکت هیچی دەنووسی ؟

— کەمو کورت •

— کەوا بوو دەتبینمەوە •

ئێجگار کزۆڵە بوو • پەنجەکانم سۆزیان لێ دەتکا ؛ دەستێکی سۆزناکم بە کاکۆڵیا هێنا • شادییەك ناوەوەمی فێنك کردەوە • بە خۆم ووت ( کەوا بوو نەمردووە) پیرێك لە سایەی کێلە قەبرێکا هەڵتروشکا بوو ، زانیم کە دراوسێ مالی کۆست کەوتووە • ووتی : هاوڕێکانی لە پەنجەی دەست کەمتر بوون • (دەنگی بە دیوار دەچوو ، گەر دیوار بدووایا) •

ووتم : دیارە دەیویست خۆی لە چاوی خەڵکا ببینێ !! (لەم قسانە

چۆن دەگات ؟ ) ووتییەوە : ڕقی لە هێڵی جادەکان بوو ! ووتمەوە : دیـاره سەر سەختو دەمار گیریش بووە !!

مەلا گوپ ئاوساوەکە بـەڕوو گرژی تەلقینـە ڕەوانـەکەی دادا • زایچەکەی (س)ی پێچایەوە (ویاتیك ملكان رحیمان شفوقان ••• آن •••) ناو بە ناویش دەستێکی لەرزۆکی بۆ چاوە پووکەکانی دەبرد کە دروێنـەی ئاولەیەکی کۆن بوو •

بێدەنگییەکی ئەفسانەیی ئەو گوزەرەی پێچایەوە ، سامی مردنیـش پاڵپشتی بێدەنگییەکە بوو •

سەرو بەردمان لە گۆڕە ئاوڕشێنکراوەکەی کردو گەردنمان ئـازاد کرد ! هەنگاوەکان •• لە لێژگەی گۆڕستانەکەدا پەلەیان بـوو !! پێـش بڕکێیان دەکرد ! پیرەکەش بەردی خۆی هاویشت •

[ پشتی دەستی بە نەخشەیەکی ڕەمەکی دەچـوو ، وەك ئێسکەکانی هەڵەتو دەمارە شینەکانی ڕووبار بن ! ] بەدەم ڕێگاوە ، دەست نەخشەکە بە مەلا گوپ ئاوستاوە مۆنەکەی ووت : کابرایەکی ئاسایی نەبوو •

ئەو ڕستەیە پتر گیانی توێژینەوەی لە لام ورووژاند • ئەو شەوە شاری (ئارابخا) کەنیزەکێکی ڕەشی ڕووتی ڕاکشاو بوو • من لەگەڵ ئەستێرە چاو کزەکانی کاروانکوژە دا باوێشکمان دەدایەوەو پاسی شارەکەمان دەکرد •

— ئەم چەند پەڕانەم دەست کەوت •

دەنگی شێرکۆ تامی کولیچەی هەبوو •

— سوپـاس •

هیچی نەووت• لەماڵەوە ، خۆم بۆ کارەکە تەرخان کرد • پەڕەکانم تاوتۆ کرد • ئەوەش ناخەمە پشت گوێ کە (س) لەم حەوتاقەیەدا ، خاڵو

وێرگوڵو نیشانەی دا نەناوە ، بگرە تاڵو تەرا ، ووشەیەکی لە یەك دێڕ دا بە هەتیوی نووسیوە ! منیش پاش دەسکارییەکی کەمو پێویست ، نوێشكو دەسکەنەی ئەو حەوتانەیە ، هەر بۆ مێژوو و تۆمار دەنووسمەوە •

★ ★ ★

**شەوی هەینی :**

شێرکۆ نوستووە • لیستەیەکم بۆ ووشە دزێوو پف دراوەکان کرد • شەوێکی وا مەگەر بە دەگمەن بۆ ئاودێرەکان هەڵبکەوێ • مانگەشەو پۆپنەی دار کاژەکان بە پوولەکی زیو دەڕازێنێتەوە • ئێستا تاقە ئاوەکانیان بە جۆبارەکانا دابەش دەکەن •

تەنیام • (ئەم ووشەیەی لە دێڕێکدا نووسیوە ) •

ئەم ووشەیە (تەنیایی)یەکەی من دەگرێتە خۆ !!

نازانم • « دیسان ئەم ووشەیەشی لە دێڕێکدا نووسیوە » •

لە لادێ بووکم کە دایکی شێرکۆ ، لەسەرە مەرگا داوای کردم • ناچار کراسێکی زستانیمیان نایە سەر دڵیو گیانی سپارد • ئەو ڕۆژە ••• بزمارێکی ژەنگنە لە ژیانمدا • (دەروێش عەبدوڵلا)م دڕاند ، چونکە بە ساکاری نووسیبووم ، بیر لە ئەسکەندەری شاخدار دەکەمەوە، سەرتاشە بەسەزمانەکە دیقی کردو لە تیماری ڕووبارێکی تیژ ڕۆدا نهێنییەکەی چرپاندە گوێی قامیشەڵاتێك ••• قامیشەڵانیش بووە سەدان نەیو ئاوازەکەی بووە هەڵاڵەو پەخش بووەوە ، تەنانەت لاپاڵو کێوەکانیش دەنگیان دایەوە : ئەسکەندەر شاخی لێ رواوە •• شاخی لێ ڕواوە •• من ئەو سەرتاشەم • هاسان نییە مرۆڤ بۆ کەسێکی دیکە بە کەڵك بێت ، نەخوازەللا •• بۆ جیهان •• ئەمڕۆ بوونە مەیموون نزیکترە لەوەی ببێتە مرۆڤێکی ••• «ڕستەکە ناتەواوە» •

**شەوی شەممە :**

بۆ کیلۆیەك خورما چوومە ڕیزەوە ! مەگەر بە قەڵەنگ جێگای خۆت لەو پاڵەپەستۆیەدا بکەیتەوە ! مردن بەرەنگارییەکی ڕاستەو خۆیە بۆ سەلماندنی «بوونی» ئادەمیزاد • ووشە چۆن بزەی بیرەکانمان دەتاسێنێ وەهاش قرژە ڕۆژگارم دەچۆڕێنێ • پزیشکەکە ووتی : پشوو بدە • شەوی ئەنگوستە چاو ڕۆژووی خۆی بە ڕەنگی پەلکەزێرینە دەشکێنێ • دیارە مرۆڤ ئەو کەسەیە کە کالآی یەکێکی شێلا بە خەندەوە دەڵێ : ببوورە !! لاپەڕەی ژیانم پڕ بۆتەوە • لەم پەڕینگەیەوە بۆ کوێ ؟ لە کوێوە بۆ کوێ ؟ گوێم لە قاقای بڕێ سەرمەستی جادەکەیە ، بۆ لە خواردنەوەشدا من پێکەنینم نایەت ؟! دەبێ لەو دونیاش پێکەنین نەبێ !!

تێبینی : لە پاڵدمی پەڕەکەدا نیگاری کلیلێکی کێشاوە •

**شەوی یەك شەممە :**

ئەوا گریمان هەموو کێشەکانی ژیاریمان چارە سەر کرد ، خۆ مێردەزمەی مەرگ تاکە نەمری ئەم زەمینەیە • سەرم لە پزیشکەکە دایەوەو دڵنیا بوو لە بۆ چوونەکەی پێشووی •• دوو مانگ •• قرژە •• شێرپەنجە•• ڕووکاری ناوەوەی ژوورەکەم وەك باڵآڕووانی جیوە وەریو شەش پاڵوویەکی کەنەفتو گوێیاو پێك دێنن • خۆم بە شێواوی دەبینم • لەگەڵ گزنگی خۆرا ، نازنازەکان دەپشکوێن ، ( ئایشەشان ) خەمی دیاربەکرییەکان دەلاوێنێتەوە • بە ئێستای من چی ! دووا ڕۆژی شێرکۆ کوستم دەخات • کات گوێزانە ••• قاچییە ، ژێیەکانی ناخمان دەتاشێ / دەقرتێنێ • ئای لە چاوەنواڕیی مردندا پەتی نێوان منو کێو کێ دەپسێ •• مردن •• چنگە کرێی شێرپەنجە •• ئای شێرێکی کلۆڵم ، بریندارمو لە پەسێوی لێرەوارێکدا ، دەوەنەکان بە خوێن ئاو دەدەم • شێرکۆ داوای ڕێواسی

گرد ! خۆی گەوزاندەوە • ئا لەم گەرمە سێرەدا ، ڕێواس لە کوێ بێنم ؟
شێرکۆ ••• تۆم وەك باران خۆش دەوێ • دەزانی باران چییە ؟

**شەوی دوو شەممە :**

[ لاپەڕەکە سپییە • لێرەو لەوێ شوێن پەنجە کەلەی ؛ یان پەنجەی دۆشاو مژەی ، کچێنیی کاغزەکەی بزڕکانـدووە • وا بـۆی دەچـم کە پێخوسەکە بە هانایەوە نەهاتبێ‌و دەست‌و پلی مەرەکەباوی بوو بێت • هەر بۆیەش بە پەنجە تووتە ڕاستوچەپێکی زەبەلاحی لە پەراسووی لاپـەڕەکە نـاوە ! ] •

**شەوی سێ شەممە :**

قرژە نەمکوژێ ، ڕوواڵەتە ناهەموارەکان بەو کارە هەڵدەستن‌و زیندە چاڵم دەکەن • مردن گوایە چوون یەکە ؟! ئای کە زمان چەند نالەبـارە بۆ ڕاو کردنی ماسییە ورشە دارەکانی ڕاستی‌و باڵندە سەوزەکانی هەسـت‌و جوانی •• ووشە دەبێ چی بێت ؟ جمگەیە ، کە لە جێگەی خۆی ترازا ئیتر ئەفسووس وەك خۆی ناگیرێتەوە ! لەم ژیانەدا زوربە بە موهەریج دەکەن کە لە سەر گوریسێکی شەتەکدراو دا ، گاڵتە جاڕی بنوێنن •• نا •• من •• گەپجاڕ نیم • کۆسەوەوی نیم • نەمووت ووشە ئامرازێکی کەمبرە • ئەگینا، هەرگیزاو هەرگیز زیبوانی ناو خەلە لە کۆشی ئارامی گەنمـدا جێـگای نابێتەوە !!

[ دوو نیشانەی سەر سورمانەکە ، هی منن • لە دووای دوو دێڕیشەوە کورتکراوەی شاری مشکانی نووسیوە ] •

مشکەکان ژوورو شەقام‌و کێڵـگەو کۆلیتەکانیـان زەوت کـرد • دانیشتووان پەنایان بۆ زوڕناژەن برد ، ئەویش لە سەر تەپۆلکەیەك پـیرە

زوڕنای ژەند • لافاوی مشکانی ڕامالّییە ناو بیرو کاریزەکانەوە •• [دێرێکی پەڕاندووە] •• بۆیە زوڕناژەن کرایە قەڕالّو تاجی زێڕین و پیرۆزەی نرایە سەر •••

دلّداری ئەگەریش مەرهەم نەبێت ، خۆ ئێش سرەوێنە • ڕەنگ حەبی ژانە سەری منە •• نووچ نادەم •• نادەم •• نا •• نا ••

**شەوی چوار شەممە :**

کە قسە زۆر بوو • ئاگرکوژێن پێویست دەبێت • پزیشکەکان بڕیاری یەکجارییان دا • ووشە نییە لە نەستی مرۆڤدا لە ووشەی (هیچ) ڕاستگۆتر بێت • شێرپەنجە •• قرژە واتە : هیچێکی ئەوتۆ کە هارمۆنییەکی بەرجەستەی هەیە لەم پانتاییەی ترۆپکی ژیانم • نرڤانا •• ئای مرۆڤ تۆ گولّدانێکی سووالّەیت کە شکایت گولّدانت پێ نالێن • گورزەگولّ / دیوار / گلّینە / مێشك کە وەری / ڕووخا / وردوخاش بوو / پژا ئەوسا چەمك و مەبەستێکی هێژا نابەخشن • ئای خدر زیندەکەی زمناکۆ ؛ ئای بروسکەکەی (خانی) ؛ هەلاجەکەی (زەرزی) ؛ ئای کامەرانی •• باران •• چەند بە پەرۆشەوە بووم کە بتانگەمێ ، ئێوە لە درزی پەنجەکانمەوە بوونە وردە ماسیی خلیسك • ئای دەریای بێ بن و گولەگەنمی ملکەچ ••• شینایی و ڕەنگی زێڕینی ئێوە لە کام تابلۆی (ڤان کۆخ)دا بدۆزمەوە ! ئێستا لە دەرەوە ، دەزووە ڕەش و سپییەکەی کازێوە لە یەك دەترازێن • دەنگی مەلاو کەلّەبابەکان دەئالۆسکێن • نامەوێ بمرم ••• نامەوێ ••

**شەوی پێنج شەممە :**

بە مەشق و ڕاهێنانەکانی شێرکۆ دا چوومەوە • لاولاو ئاسایی دەستی لە گەردنم ئالاندو :

ــ بابە دایکم لە بەهەشتە ؟

چۆن وەلامی بدەمەوە ! پرسیارەکەی سێبەری ترسی پێوە لکابوو کە نەیتوانی بە باشی بیشارێتەوە • بەڵێ ، هەر کەس بۆی هەیە نارەزایی خۆی دەرخات بەلام گرینك ئەوەیە : لە نشێوی دوو رێیاندا ، کامەیان هەڵدەبژێرێ؟ ئەو دەپرسێ ! منیش لیستەی ئەو ووشانەم لا مەبەستە کە دزێوی بە فەرهەنگەکان دەدەن ، وەکو : مردن / جەنگ / هەژاری / چەوساندنەوە / قرژە • ئەمانە دیواری مێشکم دەڕوو شێنن ، هیرۆشیمای گیانمن • نامەوێ بمرم •• ئەی ژیانی بێ خەوش تۆ دڵداری ڕاستەقینەی منی •• هیچم لە تۆ ناوێ ، لە تۆزێ شادی بەولاوە •• شادی •• شا •• دی •

**تێبینی :**

لە لاپەڕەیەکی تردا ، پارچە هۆنراوەیەکم دی • ئەوەی ڕاستی بێ وامزانی بە منیەتی ! چونکە منیش جارێك باوەشێك کتێبم هەرزان فرۆش کردو دام بە خۆراکێکی چەور بۆ زارۆڵەکانم • ئەمیش هۆنراوەکەیە :

**زۆری برسی بوو**
قان کۆخو (قانون)ی دەفرۆشت •
لای کۆنە فرۆشەکەوە ، سێ پەنجایی
گۆڕی بە سەندەویچو گۆشت
دەمی سڕی
ئاورێکی دایەوەو ڕۆشت •
زۆر تینوو بوو
بە نیگا ، پەرداخێکی تۆشت
لەو پاشەڵەی کە شەقامەکەی سەر دەبڕی •

**تەمووزی ١٩٧٩**

# ئـاپۆ جوامێر
# لە پێشانگای چـاواندا

## ( ١ )

هەبوو نەبوو لەم شارە بێ خەمخوارە نیگارکێشێك هەبوو ، لە رادە بەدەر گرینگی بە چاوی مۆدێلەکانی دەدا ، تا وای لێهات لە چاو بەولاوە هیچی تری ناکێشا • ژوورەکەی ( کە خەڵوەتـــگاشی پێ دەووت ) دەیـــان سکێچو تابلۆی چاوی پیا هەڵواسرا بوو کە بینەر وایدەزانی رێگای هەڵـــە کردووەو لە پۆستەرگایەکی چاو دایە • لە هەر چەشنە ، رەنگدارو بێرەنگ، بە رۆن بۆیەو پاستیل ، بە مەرەکەبی چینی ، بە ئاو بۆیەو ماجیك ، چاوەکانی ژوورەکەیان کردبووە شاتۆیەکی تۆماری • سەرەرای ئەوەش ژمارەی لـــە تابلۆکان دەداو هەمیشە سۆفیگەرانە وێڵ بوو لە دووی چاوێك کە پیشانگای مەراقەکەی پێ تەواو بکات ، هێدی هێدی لە گەڵیان دا دەدوا ، بە تایبـــەت کە سەرمەست دەبوو ، یان کە بیری دەگەشایەوە ، لەو کاتـــە ناسکانـــەدا ، تابلۆکانی بە مرۆڤی راستەقینە دەزانیو هەر بەو پێیەش سکالاو هەڵسوکەوتی لە گەڵیان دەکرد ، هەر چەندەش بە زمانی رەنگو هێـــڵو سێبـــەر دەدوا ، جاری واش هەبوو کە هەستێکی ناکاویی خۆی بە پێنـــووس دەسپـــارد • ئالێرەو لەوێ ، لە سووچی تابلۆیەکدا ، لە دیوارەکان ، لە سەر پـــارچە کاغەز ، ووشەو رستە دەبیندرا • هەر بە زنجیرەی تابلۆکان وا دەردەکەوت کە بیر لە زاوزێ کردنی نێوان هێڵو ووشە بکاتەوە ، بۆیە دووایین تابلۆی

بە پیتو ڕستەی سەوز کێشا بوو • دەیووت : (مرۆڤ چاوە • ئەم چـاوانە منن • بە هەموویان یەکێکی دینامیکین • چاو کانگای نهێنیی کوڵەگەی ژیاریمانە ) •

هەر بۆ ئەم مەبەستەش تابلۆکانی بە چەند بەشێکا جوودا کردبـووە وەك : چاوی جێگا بین / چاوی کات بین / چاوی دەروون بین / چـاوی دوور بینو ••• هتد • بێگومان خۆی بە کامێرایەکی ئامێر نازانی کە پەنـا بۆ دیاردەی / توێکڵی دەرەوە ببات ، بەڵکو وەك بیەوێ کاکڵەو ژوورەوەی کەسەکانی بکێشێو لە تاکە چاوێکدا ، هەستی جوراو جۆری کۆ دەکردەوە، بۆ ئەوەی لە ئاکامیشدا بۆی بلوێ کە گرفتی کۆمەڵایەتیو ڕۆشنبـیریو ئابووریو سایکۆلۆجیو ڕامیاریش لە توێی چاوەکاندا دەرببڕێت • ئـەم خولیایەی زیاتر هانی دەدا بۆ تێکەڵ بوونی خەڵكو قووڵتر بڕوانێتە ئـەو دیوی چاوەکانەوە ، بۆیە پەیوەندییەکی سەمیمیی لەگەڵ زۆر کەسدا هەبووە بەشداریی شینو سووری ئەمو ئەوی دەکرد ، لە ئاهەنگو گرد بوونەوەکاندا بانگ دەکرا ، لەگەڵ هەر توێژێك دەبیندرا ، ئەمەشی بە ئەرکی پشکنینی کەرەستەی خاو دەزانیو بە بەشێکی دادەنا لە پەیامە خۆشنوودو پیرۆزەکەی •

( ٢ )

ئەو شەوە کاتژمێرەکەی مەچەکی یەكو نیوی لە تەمەنی ڕۆژی ئایندەی دیاری کرد • چاکەتەکەی بە بزمارێکی ژوورەکەیدا هەڵـواسی • دەرەوە تاریکیی لە بەر کردبوو ، لە بەر مەسـتیو سـەرگەرمیو تەنگەتـاویی میزڵدانی ، دەرفەتی ئەوەی نەبوو کە پێڵاوە پاژنە چەوتەکانی تورِ هەڵدات• چاوی هەتەر بوو • چووە ئاودەست • لەوێ ، بیری گەشایەوە • چـاوی نوقاندو خۆی گوشی ، کەسـێك بێـدار نەبوو ئەگینـا پـێی دەووت : (دەزانی لە نێوان سکی برسیو ورگی تێرو تەسەلدا دەیان تەلانو بزماری

چیمەنتۆ هەن ! ) گەڕایەوە • لە کەنار چوارپایە شلۆقـەکەیدا لەنـگەری بەست • چاوی لە ڕاستەوە بۆ چەپ ، لە چەپەوە بۆ ڕاست ، بە ڕەشبەڵەکی تابلۆکانا گێڕا (ئەو پیرە خزمەتگوزارە ، لە ئاهەنگی پاش مارە کردنـەکە ، چاوێکی دەگمەنی پێوە بوو !! چاوێـك چەنـدین هەسـتی وەك تـرس و حەپەسان و هەژاری و نهێنیی حەشار دابوو !! دەبێ چاووم پێ بـکەوێ ، ئەگینا هیچم بە هیچ نەکردووە ) هەستا • لە عاست تابلۆیەکدا وەستا • بـە ئانشك خۆی بە دیوارەکەوە گرت • چاوەکەی لێ بووە کەسێکی گیاندار :

— بەر پێم نابینم تۆش چاوێکی کە بە خوێنی دڵ ڕووواندتم •• کامەتـا دڵسۆزیت !

چاوەکە هاتە وەلام : تۆ ئەرکێکی گچکەو تەسکت بە من سپاردووە ئەویش بینینی جێگایە •

هیچی نەووت ، بەلام گوێچکەی بۆ دەمی چاوە جێگابینەکە شل کرد :

[ هۆڵێکی بەرینی نۆ بە شەش مەتری بوو • مۆمی مار پێچی سپی و زەرد ، وەك تەمەنی لانەوازەکان دەتوانەوە • دوو تەناف گلۆپی ڕەنـگاو ڕەنگ ، ڕاستوچەپێکی ڕووناکییان بە ئاسمانە پۆشتەکەدا پەخش دەکردەوە• چەپکە ڕەنگەکان لە شووشە بەندی ماسییەکاندا کەرنەفاڵێکیان سـاز دەدا• چلچرایەکی پەمەیی / وێنەیەکی بازاڕی کە سێکسی لێدەتـکا / دوکـەڵی بۆنداری کنگ سایز / لێوی ئەرخەوانی / چاوی بازنە داری خۆڵەمێشی/ قەنەفەی چەرمی کل ڕەنگ / ملوانکەی ئینجی و پلاتین لە مەچەکی خرپندا چەشنی ئاوێنە پەڵەی ماکیاجەکانیان لە چـاو دەگرت / مـام جوامـێری مێشهەنگیش کراسێکی قەوزەیی لەبەر دابوو ] •

وایزانی کە زەردەواڵەیەك بە بڕبڕەی پشتییەوە دەدات • ڕاپـەڕی و (جێگا)ی بە کێشەو نەبەردی سـەرەکی نـەزانی • کورسییـە بالـدارە

نیوداشتەکەی وەك منداڵداتێکی بە سۆز هاتە پێش چاو ، ویستی خـۆی وەکو نەزاوێکی هەشت مانگدا گرمۆڵە بکات • ڕاپەڕی • چاوەکانی شێوەی مانگی یانزە شەوەیان هەبوو • وەرچەرخایەوە بۆ لای تابلۆیەکی دیکە :

ــ چاوی دەروون بین ئەی تۆ چیت دی ؟

مات بوو • ووتییەوە : پەنهان نەپێکن ئیتر ئێوەو ئەم دیوارانەیـان نەووتووە •

چاوە دەروون بینەکە ووتی :

[ بووك‌و زاواکە جووتێ ماری ئاشقەو ماشقە بوون • ئاهەنگەکە بـۆ کاڵاو پێڵاوە بریقەدارەکان بوو • تەگە نێرەکان ــ ساتێر ــ ئاسایی بینیـان لە مەی دەداو دەیان چرپاندە گوێی یەکتری • زمان زمانی ژمارە بوو • سمت‌و کەفەڵ‌و پووز داوەتی گەڕەکێکی خانووە فوڕەکانی لێدە بوو • لەشە ڕووتەکانیش هەر یەکەیان هەڵگری مێژوویەکی لێخن بوو • تریفانەوەی پرتەقاڵی / نینۆکی دەستکردی گوڵهەناری‌و ••• خەنەیی / بزەی کـاڵ‌و بەقەم / ژووانی ڕەنگ لە ژوورەوەی خومییاندا دەخنکا • هەندێك بـە تیمساحیان دەکرد ! هەبوو بە بزنمژەك دەچوو ! بە کەمتیار ••• مارمێلکە •• زالوو ••• گیوە ••• قارچك ] •

نیگارکێشەکە لە گێژەنەی تووڕەییەکدا بە نەفرینەوە هـاواری کرد : بەر چاووم تەڵخە هەر وەکو لە شووشەیەکی بیرەی گەرداوییـەوە بڕوانـم وایە ••• ئێوەش هەر دیسەنە ئاساییەکان دەجوونەوە !

ناوچەوانی گوشی‌و بە خۆی ووت [ ئێش خۆشەویستی‌ی لە دووایە•• مرۆڤ گەر بیەوێ لە چلکاویشدا ، خۆر دەبینێ • دەمەوێ بزانم ، ئەو بـە

سالاّ چووه بۆ ئەو داوەڵە عەییارەی هەڵبژارد بە ژنی خۆی ؟ بۆ ؟ بۆ ؟ بۆ ؟ ]
لە دیوارەکەی ئەو لاوە دەنگێك هات • لای کردەوە • چوار مشقی لە خوار تابلۆی چاوێکی کات بیندا کروشکەی بەست • دانی بە خۆیا گرت •

[ زاوا دەیویست بە زوویی بگات • پێپلیـــکەکانی سێ ســێ دەبڕیو خێزانەکەی سەرگەردان کرد • نیازی وا بوو کە کرنووشی بـۆ بـەرزو پەنجەی ڕێزی بۆ درێژکەن • چاوی لە لوتکەیـەکی پرشـنگدار بـوو • ژنەکەشی هەر بۆ دابین کردنی بژێوی نۆبەرەکەی • بەرەو نەبیندراو هەلات• جوانیو نەرمۆڵەیی بووە سێلاوگەو بەرەو هەڵدێری لەش فرۆشتن ڕایماڵی• ڕۆژگارە ••• ئەو بووە فەرمانبەرێکی پایە بڵندو ئەمیش دەستاو دەسـت بووە ئافرەتێکی مۆدێرنی ناسراو • ئەو هەلاّتووی هۆزو ڕابردووی بوو • ئەمیش ناوێکی زەنگوڵە داری بۆ داهاتووی هەڵچنی • ئەو بە هۆی کۆڕی کریستالو سالۆنە بەرینەکانەوە بووە ئەندامێکی متۆی جـنو کۆنیـاكو شامپانیا • ئەمیش لە پەیژەی بادەی قاچاغەوە داندرا بە پاڵێوراوێــکی ئەو جۆرە کۆڕو هۆلاّنە ] •

توڕەییەکەی پەرەی سەند :

ـــ بەسە •• بەسە • ئای چەند تاڵە کە مرۆڤ هۆشمەندو بە ئاگا بێت ••

هێلنجی دایەوەو ڕووی لە ئاو دەستەکە کردەوە • لەوێ زەرداوی ئاهەنگەکەی هەڵهێنایەوە • شەپێ ئاوی لە ڕووی دا • چاوەکانی بوونـە گوڵئەستێرەو درەوشانەوە • بە خۆی ووت (لە ڕەگی خۆیان دابڕاوون •• دەیانەوێ لە سەر بنجی تر بڕوێن ! قاقای نێرینەکان لە گوێمدا زرینـگەی لیرەی ڕەشادی بوون • مێینەکانیش کوتومت لە چاوما بە کەرەستەی ئاسیاو سوورەکەی لۆتریك دەچـوون •• ) کـوورەی نـاوەوەی دەجۆشـا • دەمارەکانی گرژ بوون • خوێنی هەڵچـوو • ویستی پەلامـاری گشـت

تابلۆکان بدات‌و وەك بابۆلەیەك بیانهاویتە گەرووی ئــاو دەستــەکەوە • ئێستێکی کرد • دەنگێکی زولاڵ هەر وەك بایەك لە ڕنــووە بەفرەکانــەوە هەڵاتبێ ، نەرمە گوێی تەزاند • سڵەمییەوە • تابلــۆی چاوێــکی ڕەشی خۆماڵی زەردەخەنەیەکی بۆ هەڵڕشت :

ـــ مەگەر من بە هانانەوە بێم •

هەر وەکو لە بۆسەدا بێت ، خۆی لە چــاوو گوێیدا کــۆ کردەوە • چاوی دوور بێ ووتییە : [ دووا ڕۆژ لە کرۆکی ئێمەدا دەخولێتەوە ، دیارە دەرگای لە گرێژنە ترازاویش خۆی لە بەر ڕەشەبا ناگرێ ] •

خامۆش بووەوە هەر وەکو بۆلەمرێك بێ‌و ئاوی بە سەر دا پرژابێت••

ـــ چاوانی جێگا بێ‌و کات بێ‌و دەروون بێ هەموو ڕاستگۆن • بەشێکن لە تۆ •• لە بیرت • لە هەستت •• لە ڕەنگەکانت •• ئــەو کەسانــە زیندەوەری میکانیکین ، کۆك کراوون ••

هەر چەندەش توڕییەکەی تار بوو بەڵام بە دەنگێکی توورەوە :

ـــ ددزانم •• دەزانم ، بەڵام خواهیشتم ئەو زاوا گەوجەو ئەو قەڵتاغــە کۆنەیە ••

ـــ دەیانەوێ کەولێکی تر بپۆشن ئەگەر کاژی ماریش بێت • تۆ بە دووای چاوێکدا بگەڕێ کە زمانی پاراوو سروودی هەژێن بێت • ئەوانــە ڕێبازو ڕووگایان لە لا دوو ڕووی دراوێکە •

هێور بووەوە • بیری گوشاد بوو • بە خۆی ووت ( چاو •• چاو •• دۆزیمەوە • چاوی ئەو پیرە خزمەتگوزارە کلیلی نهێنییەکەی لە لایە • هەر دەبێ چاووم بە چاوی بکەوێ•••) باوێشکی دایەوەو ئاگای لەوە نەبوو کە خەو کەنگێن لە ئامێزی خۆی گرتووە •

## ( ٣ )

ــ ئاپۆ جوامێر دەستم دامێنت •

جوامێری شاران گەریــدە لە نیازی ئەو ئاگادار نەبــوو • چاوێــکی پرسیاراویی ئاراستە کرد وەك بڵێ پیاوێکی کەنەفتی بە ساڵا چووی وەك من دەبێ شیاوی چ ئەرکێك بێت بۆ جوانێــکی وەك تــۆ • ســەرنجی بــرۆ یەکدگیرەکانی داو : (بە دەوەنێکی زۆزان دەنەن ! ئەو هێڵانەی لاچاوی ، لە نزیکەوە بە جێ کاسنی بێکاری دەچن !! ووشە لە هەڵوێستی وادا چۆك دادەدات •• دەی ، چەکی کاریگەری من ڕەنگەو هێڵە ) •

ــ کارێکت هەیە ئاغام مشوری بخوات ؟

ــ نا •• کارم بە تۆیە •• دەمەوێ •• چاووت •• بدەی •• بە •• من ••

ــ ••• !؟

ــ مەبەستم نیگاری چاووت بکێشم •

ئاپۆ دەستی بە یەکا داو بێدەنگ بوو بە چەشنی ئەوەی خۆڵی مردووی بە سەرا کرابێت •

ــ ئاپۆ جوامێر تکات لێدەکەم •

ــ کوڕم لەم شەقامو کۆلانانە سەدان چاوی چوان هەیە ، شین ، سەوز ، کەژاڵ •• چیت لە چاوی بێڕەنگی من داوە !؟ ئابیرم کەوتەوە ، لــە دێیەکەماندا منداڵێك هەبوو چاوێکی قاوەیی‌و ئەو چاوەکەی تــری کوژەکەیی بوو •

نیگارکێشەکە لە دلی خۆیا ووتی (ئەمیش بابەتێــکی تر) بەلام لــە داخوازییەکەی پەشیمان نەبووەوە ، بەرۆکی مام جوامێری گرتەوە •

ـ باشە دەستم بەتاڵ بوو دێم • ئا ، ئا ، ماڵتان دەناسم •

دووا هەڵمەتی بردو خۆی لە مام جوامێر هەڵسوی •

ـ شتێکی ترم ماوە • (ئاپۆ چاو دەکاتەوە) ئەگەر پێم بڵێیت هەتا هەتایە سوپاس گوزارت دەبم •

ـ بڵێ بزانم •

ـ ئاپۆ تو ئەو شیرە خاوێنەی دایکت ، وەك لە ئاهەنگەکەدا بەر بـای گوێم کەوت ، کە ئاغات رێزت لێدەگرێ گوایە لە بەر ئەوەیە هـەر دووکتان پەروەردەی شارێکن ، یان هۆیەکی تری هەیە ؟

مام جوامێر زمانی پەڵت بوو •

ـ ••• ئاپۆ ئەوەش بزانە کە دەبمە بیرێکی داپۆشراو ، سەرەڕای ئەوەش یاریدەی نیگارەکەشت دەدات •

ئەم لاو ئەو لای خۆی پشکنیو بە چرپە :

ـ دەتەوێ درشتم پێ خورد بکەیتەوە ، هەی فێڵباز ، بە مەرجێك ئەگەر نیگارەکەم نیشان بدەیتو لای کەسیش نەیدرکێنی ئەگینا شار بـە دەرم دەکات •

نیگارکێشەکە بە چاو قایل بوونی خۆی دەربڕی •

ـ •••نهێنییەکە هەر ئەوەندەیە کە ئەم ژنەی ئاغام ، کە بەشداریت کرد لە ئاهەنگەکەیدا ، هەر هەمان ئەو ژنەی پێشوویەتی کە دەر بـە دەرو ڕیسوای کرد •

نیگارکێشەکە لە حەژبەتا هیچی بۆ نەووترا • هەستایە سەر پێو دەستی مام جوامێری وەرگرت بە توندی گوشیی •

ـ زۆر سوپاس ، له بیرت نەچێ • پەیمان بێت دانەیەکت له نیگارەکە بدەمێ ••

ئەو له دلی خۆیدا ووتی (بۆ ئەوەی له ژووری مالەکانتا هەلی بواسیت ) ئاپۆش به خۆی ووت (مالم هەیه نیگاری تێدا هەلواسم) •

**ئابی ١٩٧٩**

## (( ئیڤانکا ))م چــۆن ناسی ؟

پەیکەری (بودا)یەکی کوژەکەیی بە گەردنییەوە هەڵواسرا بوو . ئەو ملوانکەیە ئێمەی بە یەکتری ناساند [ ــ ئیڤانکا ••• ــ میرزا شوان ] پاڵــە پەستۆیەکی ئەو تۆ بوو کە ڕاوەستاوێك دانیشتووانی لای دەست شۆرەکەی بە بەختەوەر دەدیت• لای پەنجەرەکەوە دەرفەتێکی چاکم بۆ رەخسا کە بە دڵەوە دیمەنی خۆرئاوا هەڵمژم ؛ زنوێرێکی تێراو لە تــۆی شووشەیــەکی ئەرخەوانییەوە بێنە پێش چاووت • لەو لاشەوە ، خۆر ••نائێکی برژاوی وەك دەنووکە کەو بوو کە دەخزایە پشت کەوانەی ئاسۆگەوە •

سەدان چاوی هەمە چەشنەو هەر جووتێ لە عاست خۆیانــەوە بــۆ مەبەستێکی تایبەت ، لەناو فارگۆنەکەدا دەخولانەوە • منیش خۆزگەم بــۆ (بودا)کەی گەردنی ئەو شۆخە خواست کە ئاسوودە شۆڕ دەبووەوە نــاو بلووزە زەیتوونییە دەم دابڕاوەکەیەوە •• کتوپڕ وەك پەنجەرەکان دابخرێن، دەرەوە بووە تاریکستان • سەر ماشو برنجەکەی تەکم بە تورکی ووتی : لەم جۆرە توونیلانە زۆرن •• لە سەر خۆ کەوتمە ژماردن ، لە نێوان هــەر بیست ژمارەدا ڕووناکییەکی کز هەندێ چاوی دەرزیاژەن دەکرد ، لە دوو سەدو شەستو سێدا خۆر ئاوایەکی خەست هەندێ چاوی تری شەوارە کرد [ خۆ ئەم ڕووناکییانە بە بۆڵەمڕی هۆشی ناکاوی دەکەن ! یان دیارە بێچووە سەمەندەرن !! ] نانە دەنووك کەوەکەی خۆراوا سووتا بوو • سروشــت مەگەر لە ئاوڕینگی چینکە بەردێك نەبێ ، کراسێکی شۆڕی ئاگربارانەی

مۆرێکی تێری شەوانەی پۆشیبوو • (ئیڤانکا) زەری پێست بوو • بـیرم بۆ لای کابانێکی ڕوو شەمسی لای خۆمان ئاوەژوو بووەوە ، ئـافرەتێکی پێ قەڵەشاوی ماسیگری ناو زۆنگاوەکان ••• دەمویست بیدوێنم ئەگەریش بە زمانی چاو بێت [داڤنشی سەدان سکێچی بۆ جوولانەوەی دەم‌و لێو کرد هەتاکو خەندەیەکی باڵداری لە لا لێـوی مۆنـالیزا دا ژیانـد ] عەوداڵی خەندەیەکی وا بووم • پێشتر خەونـم بە وولاتی واق واقـەوە دەدیـت‌و ئێستاکانێ سەرەڕای چەند ڤیزەیەك ، هیچ نەخشەیەکم لە مێشکدا نییـەو تەنیا گەشتەکەم لا مەبەستەو ڕێکەوت با خۆی سەرپشك بێت • کاوبۆیەکەی بەرم بۆ ئەوە نەبوو کە لە تەمەنم کەم بکاتەوە ، بگرە بۆ ئەوە بوو کە لـە ئەرکی ئوتوتێدان قوتار ببم‌و لە جێگەیەکی ئاوهاشدا لە بریتی بێجامە بێت• مرۆیەکی نامۆ یەکسەر بە ڕێـکردنی / ڕەنـگ‌و ڕەووشـتی / بـەرگ‌و واقوڕمانەکەی دەناسرێت ، خۆ مەگەر بە دەگمەن ئەم گەڕیدانە لەوە بـە دەر بن کە برسێتییان شکا ، بیر لە تینوویەتی‌ی ناو گەلیان نەکەنەوە ! دیارە زۆر کەس جاتنا ئاوسەکانیان بۆ ژووانی پارك‌و ئەپارتمان‌و پەناو پەسێوەکان، لە کۆڵ دەگرن • شەمەندەفەرەکە ئیقاعێکی بە کاسـەی سـەرەکان داوە [ ساڵێك لەمەو پێش شەمەندەفەرێکی پیلم بۆ ئاکۆ کڕی ، هەتا پارچەکانمان، بە تاقی کردنەوە لێك نا ، ئارەقەی شین‌و مۆرمان دەردا • فارگۆنەکان بـە جووتە هێلێکی بازنەیی درێژکۆڵەدا دەسووڕانەوە ••• منداڵێکی بـووکە شووشەش لە خۆیەوە سوار دەبوو ! دەسووڕایەوەو لە خلیسکایـەکدا ، دەخزایە لای جۆللانە سپییەکەوە !! ئاکو ووتی : بابە ئەی ئەمە چییە ؟ کـە دەسکاریمان کرد ، منداڵەکە ڕێگایەکی تـری گرت‌و گەڕایـەوە هەمـان ڕاوەستگەی پێشووی ! جارێکی دیکە ••• چووە دەرگایەك‌و لە لایەکی ترەوە سوڕایەوە !! هەموومان لەسەر ئانشك ؛ بە حەپەساوی دەمانڕووانییە ئەو کردارو جوولانەوانە ] •

ئاكۆ ئێستا دیارە لە باوەشی دایکتاو لە ناو پەڵکەڕەنگینەی خەوتێکی سەیردا مەلە دەکەیت ، منیش وا چاوی خەوالووی وێژنـــگم لە دانیشتنـــە چوار مشقییەکەی ئەو (بودا) پیرۆزە گرتووە • پێشتر بڕواییم بە تەلیسم‌و جادووی چاو نەدەهات ، بەڵام کە ئاڵۆزی کێشەکە بووم ، هۆشم وورووکایە ئەم چەشنە شتانـــەوە •

هەندێك دەیویست بای باڵی بداتەوە• بڕێك دەیویست لە پەنجەرەکانەوە سەرنجیان بنێرن • یەکدوواتێکیش ڕوویان لە ئاو دەستەکە کرد • ئـــەوی ڕاستی بێت منیش لە دەرفەتێك دەگەڕام بۆ ئەوەی بگەمە ئەویٚ‌و بە قاچاغ ڕیشم بتاشم • جووڵانەوەیەکی نا ئاسایی بەر پا بوو • کەمترین پێویستیم لە ڕۆژنامەیەك شاردەوەو دەرگاکەم لە خۆم داخست • قەیاسەی ئەوەی کـــە جگەرەیەکی قەمیش بکێشی ، بە ڕوویەکی ترەوە چوست گەڕامەوە ، تومەز بیانییەك کە ئەویش لە ڕیشەکەی چاڕســـە ، دزە خەنەیـــەکی لـــە دوورەوە تێگرتم • بەشێنەیی وەك منی کردو ئەوەی لە لام سەلماند کە پێداویســـت وای دەویٚ کە هەندیٚ جار بەرەنگاری یاساو ئەتەکێت بیت • [ بۆ ئەوەی ئێمەو ئەوان ـــ ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵات ـــ تووشی بەراوێتەیی نەبین ، دەبێت وازو چێژی تێکەڵ بوونو زاوزێمان دوو تای ترازوویەکی هاوکێش‌و هـــاو سۆز بن •• ئەگینا ••• ] بینایم تیژ تر بوو • لە ناخمـــدا لـــەگەڵ ئـــەو ئیڤانکایەی کە ناوەکەیـــم نە دەزانی ، دەدوام • دەمویســـت ئەســـتێرك‌و پەنگاوەی نەستمی بۆ ڕەها کەم‌و ئەویش وەکو پەڕاوێکی بـــەر ڕەشەبـــا بخوێنمەوە • بەدیهییەیەك هەیە دەڵێت کە دوو هێڵی تەریب هەتـــا هەتایـــە ناگەن بە یەك ؛ بەڵام من‌و ئیڤانکا جووتیٚ هێڵی تەریب نەبووین بەڵکو لـــە شێوەی دوو هێڵی ڕێکەوتە ، کوتوپڕو هەر بۆ تەنیا جارێك بە یەك گەیشتین‌و ئیتر بیرای بیرای خاڵی بە یەك گەیشتنمان دوو پات نەبووەوە ••• لەوانەشە دەیانی وەك : ئەرخەمیدس‌و فیساگۆرس دەستەوەستان بوەستن لەم جیـــا

بوونەوەیەمان چونکە نە من کەولی کەمتیارو ڕاو چیم لەبــەر دابوو ، نــە ئەویش گرکاتێکی سێکس بوو ، نوێنەری ئێوانمانیش تاکە وشەیەکی خزم بوو [ سوپاس ••• سوپاسیڤا ] ئێستاش کاتی ئەوە هاتووە کە ئەوەت لا بدرکێنم [ چۆن ئیڤانکام ناسی ؟ ] •

لە وروژانو تێکچڕژانی ناو فارگۆنەکەدا ، ئیڤانکا جێگۆڕکییەکی کردو ملوانکەکەی لە قۆپچەی پیرێك گیر بوو ! بودای هەڵواسراو گلێر بووەوە• لە پەنای جاتتا دەستییەکەمدا لەنگەری بەست •• ئەو ئاخێزێکی کرد • مــن چەمامەوە • بودای بە سەزمانم لە سەر لەپێکی لەرزۆك بــۆ درێــژ کرد • شتێکی ووت • منیش لێوم بزوا • یەکێکی سێیەمیش بە ئینگلیزییــەکی نارەوان ووتی :

— دەڵێت بۆ خۆتی گل بدەرەوە •

بە خۆمم ووت میرزا دەی لەم مەندییە خۆت ڕاپسکێنەو چیت لە بــارە وەك مزگێنییەك دەری پەڕێنە • بە کابرام ووت :

— پێی بڵێ ئەم بودایە من تووشی نارەحەتی دەکاو هەر شیاویشە بــۆ گەردنی ئەو •

پێکەنی • چاوە کەژاڵەکانی وەك (زووم)ی کامێرا لە چاووم نزیــك بوونەوە• [ وا خۆم لە گلێنەی چاویا دەبینم ] ناوچەوانی مــاچ کــرد • نەمزانی بڵێم چی ، خۆ زمانیشم بزانیبایە دیسانەوە هەر هیچم بۆ ناووتــرا بویە سەرێکی ئەو تۆم لەقاند کە هاوسەنگی چەپکێ وشــەی ورشــەدارو موفەڕك بێت • کات تووایەوە • خۆم بە خاوەندی شەمەندەفەرەکە زانــیو پڕ جزدانێ ئافەرینم بۆ ئانشتاین هەنارد •

زۆرینی کەللە سەرە کەشەنگەکان تەتەڵــەیان دەکردو پێلووی زۆر

چاویش داخرا بوون ، کەچی چاوی منو ئیڤانکا دەیانەویست لـە بازنـە ئاساییەکەی خۆیان یاخی بینو بەرینتر بڕوانن ، خۆ ئەگەریش بـن میچی فارگۆنەکە نەبوایە ، ئەوا ئاخلەی مانگمان دەبینی • [ چاویش زمانی خۆی هەیەو ڕاستگۆ تریشە لە وشەی سوواوی ڕۆژانەو دەمە تەقێی ئاوەسوو ] زۆرم بۆ ووت • ئەویش زۆری لام درکاند • هەر بۆ ئەوەی بوونی خـۆمو زێدەکەمی لە لا جێ بیلم ــ پاش ئەوەی ئەو کلیلێـکی زیویـنو جـۆرە پسـکیتێکی پێشکەشم کرد ــ کلاوێکی سورمە چنو پانی بەرزێکم دایێ • گەشـکە بوو • کلاوەکەی نایە سەرێو ئەوەندەی تر تابلۆکەی بەر چاومی ڕازاندەوە • هەستم بە تێکەلاوییەکی سۆفیگەرانـە کردو لـە تیشـکی چاوەکانییەوەش ڕەنگدانەوەیەکی وام بەدی کرد •

ئەو خۆرەی کە دەستێکی شەودێزی شەرەنگێز بە تاڵە بەنێك ڕایکێشایە ئەو دیوی ئاسو ، کەچی دەستێکی سەوزی تر خۆرێکی ئێسك سووکـی زێڕینی لە لای ڕاستمانەوە خستە سەراسۆێو ڕەنـگ پەخشانـدن • دار تەلەکان بە بێ بزەیی پەنجەرەکانیان دارکاری دەکرد ! [ کازێوە••• لە هەر لایەك هەر هەمان کازێوەیە ] ئیڤانکاش چـاوی ڕاگوێزتـە پەنجـەرەکانو گومانیشم نەما کە ئەویش بە شێوەی دەروونیی خۆی دار تەلەکان دەبینێ [ خۆ چاوێکی ئاسایی نیم کە لە بۆشاییدا ، بازنە بکێشم ، بیر لە ژانو ئازار دەکەمەوە ، بۆیە بە دارکاریم چوواند • خۆزگە دەمزانی ئەو چۆنیان دەبینێ] دارکاری کردنەکە خاوتر دەبووەوە ••• [ دیارە دەستەکە شل ببوو یانیش لە ئارامو خۆڕاگرتنی پەنجەرەکان تووشی بەزینو بۆڕ دان هـاتبوو ! ] شەمەندەفەرەکە لە ئێستگەیەکدا وەستا • دار تەلێك وەکو پەیـکەرێکی بەفرینی گێل ، بە چاوە مردووەکانی دەیڕووانییـە نـاو فارگۆنەکەمـان • ئیڤانکا کەوتە خۆی • تێر دەستی یەکتریمان ڕاوەشاند • جاتنا زەیتوونییەکەی دەستی چەپی لەنجەی پێدەداو بە دەستەکەی تری بای بایی دەکرد • دوور

کەوتەوە • مەقەسچییە بەرگ قەزوانییە سەکوت گرژەکە ، ئالآیەکی کەسکی هەڵکرد • شەمەندەفەرەکە بە کۆمەڵێ ناڵو نرکەو جیڕەوە ، ئاژووا • ئیڤانکا بووە شەبەنگێك • مەقەسچییەکەش بووە خاڵێك • [ ئەگەر ماویت ، بێوەی بێت ••• ئەگەر نەشماوی گۆڕت پڕ گوڵاو بێت هەی مەلا ئەحمەدی مەقەسچی • ئێستاکە لە پێش چاومی کە بە شەوان لە ئێستگەکەی — خورماتوو — دا بە فانۆسە سێ ڕەنگییەکەتو بە ڕۆژیش بە ئاڵای کەسك‌و سوورەوە ڕێگات بۆ شەمەندەفەرەکان خۆش دەکردو لە ئامباز بوون دەیانت پاراست ، دووا سڵاویشت بۆ گاردییانەکە دەناردو پاشان دەم بە قەتارو ئەڵلاوەیسییەوە دەچوویتە دالآنی ئێستگەکەو چاوەڕوانی شەمەندەفەرێکی ترت‌دەکرد • هەرگیز لە یادم ناچێت کە لە — مەسۆیی بەر گەچ — مانگی جارێك بە یەك دەگەیشتین‌و لە ئاوە سازگارەکەی — ئاوە سپی — مان دەخواردەوەو تێر بوونمان نەدەزانی • جۆ بلاومان دەکرد • هەر یەکەمان بەرەو گوندو ڕەشماڵ نشینێك دەکشاین ] خوات لەگەڵ ••• ئیڤانکا •••

مارتی ١٩٧٢

# بەرکوڵێك لە ئازارەکانی هەیاسی خاس

**تابلۆی یەکەم :**

ئاسمان شینی گەرداوییە ، هیچ نەبێ تۆ وەك لە تۆیی شووشەیـەکی تەڵخی دیودەرەوە بڕوانیت وایدەبینیت • گرەو باهۆزە زەلو قامیشو گیای خۆرسکی ڕۆخی زۆنگاوەکەی هێناوەتە هەڵەکەسەما • درەختەکان فرمێسکی سەوز هەڵدەوەرێننو باهۆزەکە گسکی دەداتو ، لە ناکاو ، لە دوورەوە ، ستوونێکی گەردەلوول بـەرۆکی ئاسمـان دەگرێ • ئێستـاکانێ ڕووت بێڕەنگە وەك تەمی بەیانییەکی داوێن نسێو نزارەکان • هەست بە خورانێکی ناکاوی مەچەکت دەکەیت • ئاوڕ دەدەیتەوە ؛ لکە دارێکی هشك لە نێوان زەلەکانەوە ، لە چاوتا تێکەڵ بە شینێکی خۆڵەمێشی دەبێت • هێمن دەبیتەوە، دوو قامك بۆ جێ خورانەکە دەنێریو چاو گر دەدەیـت « ئـەم بولبولـە چڵێسە قوونزەردە ، هەر چییەك بەدی بکات لە پێکـوڕەو خاڵخاڵـۆکەوـ پەلەوەرو پەخشەو مێوەی کرمۆڵ ••• دەیقۆزێتەوە» پێشان ئەم دیمەنانەت لە لا تازە بوو ، دەتووت گەڵا هەر گەڵایەو ئاویش هەر ئاوە ، کەچی لـە پیشانگای چاوتا ، نە ئەم سەوزییە بەو سەوزییە دەکاتو ••• نە لەو چەوی تەنکاوو شیناوەردەکان بە یەك دەچن • گەردەلوولەکە خـول دەخواتەوە «بە جەڕێکی گەورە دەکات کە ئاسمانی کـون کرد بـێ ! » بەلەمێـکی درێژکۆڵە ، مەنداوی زۆنگاوەکە دەشلەقێنێو جۆبارێکی کەفچڕی تووتیایی لە پاش خۆیەوە پەلەکێش دەکات ، تۆ چاو لە وێنەی بەلەمە بەرەواژەکەی

ناو ئاوەکە دەبڕێتو بە ئاوێنەیەکی مشتو مالکراوی دەچوێنی • بریسکو
باسکی خۆراوا ــ بە هۆی پۆیلەو پوولەکی ژێر سکی ماسییەکانەوە ــ لــە
کێلگەی چاوتا پەلە دەدەن •• باهۆزەکە پتر زەلەکان دەلەنجێنێتەوە • وا
چاووت لە شەپۆلێ ماسیی رەشباوی برسییە ، دێتـــەوە یـــادت کـــە لـــە
خۆرنەوەزانی زورگی شان زێیەکەدا پەلەپیتکەتان بزواندو قرمەی بڕنـــۆ
چەند جارێك ، ئەمبەرو ئەوبەر ، دەنگیان دایەوەو دووا جار لە دولێکدا نوقم
بوون «شارییەکە بەو نهێنییەی نەدەزانی کە نیشان دەبێت قولانجێك لە ژێر
سکی ماسی بگیرێت بۆ ئەوەی بە سانایی فوودانەکانیان بتەقێو ســـەراو
بکەوون » کەچی لە پاشان هەر ئەو شارییە سەر ڕووتە بە هێلو نیگاری
سەر لمی شاتییەکە ئەوەی ڕوونکردەوە کە چاو تەفرەدەرەو شت لە جێگای
ڕاستەقینەی خۆی نابینێ » زۆر شتی تری لە مەڕ ئەستێرەو مانگەوە بوتان
شی کردەوە • وا حەوت سالو حەوت مانگو حەوت ڕۆژی ڕەبەقـــە کـــە
چاوەڕوانی پەرجووی رێژنەیەکی «حەوت سالو حەوت مانگو حـــەوت
ڕۆژی تریش هەر گوژالکی هیوا دەجووم » تراویلـــکەی ئەندێشـــەکانت
دەڕەوێنەوە • بە ئاگا دێیت «وەختە کڕ بگرم» یەکسەر نوقمی زەریـــای
ئازارێکی پیرۆزی بێ سنوور دەبیت • ئێستاکە ڕەنگەکان خەســـت ترن •
ئێوارەکە ، درەختو بەلەمو خانگە فووچەکان لە زەردەچەوەیەکی ژەنگاری
دەلەوتێنێ ، تۆش جووتێ چاوی پلنگانە لـــە خوار ئـــاوایی دەگریـــتو
کونجەکەتان لە شێوەی تەنەکە ڕۆنێکی سووتاو دێتە پێش چاووت «یەکەم
کەس بووم کە تەنەکە سووتاوەکەم لە سیلەی خانووە قوڕەکانـــەوە قـــوت
کردەوە • ئیتر پەتاکە گیرۆ بوو ، تەشەنەی کرد ، بووە دوو ••• سێ •••
دە » بە کۆمەلو باربوو دە دوانزە کونـــجی هەمبەری یەکتریتـــان ڕاست
کردەوە • واهۆشت لای فاتەی ژنتە «دەبێ خەریـــکی چی بێـــت ! ئـــای
ڕۆژگارە ••• دەستی نایە سەرسکیو پێمی گوت وەکو ماسییەکی بزۆك

دەجوولێتەوە • ووتم تۆبەرە هەر وا بژیو دەبێت • ووتییەوە پیاوەکە خۆ لە فرتە ناکەوێت ! من هیچم نەووت » خەندەیەکی توورە بە پاڵووی لێوتا گوزەر دەکات «ئەو چەند سەر مێیەش نەمان کە بیاندۆشێت » •

•

**تابلۆی دووەم :**

ئێوارەکە پتر بینی رەنگەکان دەخنکێنێ ، تۆش هێدی هێدی بەرەو کونجەکەتان هەنگاو دەنێیت ، بۆنی ماسیی هەڵخراو تێکەڵ بە هەناسەی زۆنگاوەکە دەبێت • هەنگاوی ڕەوەندانەی بە گوڕ هەڵدەبڕێت • هەنگاوەکانت ڕێگاکە دەپێچنەوە • دوور نزیك دەبێتەوە ••• بچووك گەورە دەبێتەوە «دڵێکی فاتە دەدەمەوە، شێرە لە باوەش دەگرم‌و دەستیش بە تیتکە ئاڵۆزەکەی نازەی کناچەما دێنم » ئاورێك لە زۆنگاوەکە دەدەیتەوە ، لە وێوەش چاوەکانت شوێن پای ڕێکردنەکەت هەڵدەگرن‌و لە دووسێ شەقاو نزیکی خۆتا دەگیرسێنەوە • سەرنجی فەرهەنگی زەوی دەدەیت : سێ چوارگامێشی مرخن بە لاتەوە تێپەردەبن «بە چاڵە خەڵووزی گەڕۆك دەکەن ! » سەرنجی فەرهەنگی ئێوان ئاسمان‌و زەوی دەدەیت : بەژنی دار خورمایەکی ڕێك بەر پەرچی چاووت دەوەستێ • لە خوارەوە ، نیگات بە گرێچنی قەدی دارەکەوە هەڵدەکشێت‌و لە هێشووی خەڵاڵەکاندا دەتوێتەوە • «بەژن‌و باڵا زراوێکم دەخاتە یاد کە ڕەدوو کەوتەی ئاتەشەکی بێ چاوو ڕووی ئەوتۆ بوو ، چمکی کراسەکەی بۆ هەر نەختینەو دراوێك بڵند دەکردەوەو هەمیشە هەرزان فرۆش بوو ! » سەرنجی فەرهەنگی ئاسمان دەدەیت : هەورێکی نەزۆك دەبینی • «دڵم لە زەوی تۆراوە • دڵم لە ئێوان ئاسمان‌و زەوی تۆراوە • دڵم لە ئاسمانیش تۆراوە » تەنانەت دڵت لە ئێوارەکەش دەتۆرێ • وا لە دوورەوە ، زەل‌و قامیشە تەڕچکەکان پەرکەم دەیانگرێت‌و لە حەپەی سەگێکی گەڕوێ وریا دەبیتەوە • «سەگە بۆرە ،

هەر بۆ خۆت بوەڕێو قەپاڵ لە بۆشایی بگرە » هەنگاوی سەنگین دەبەیت، ئەو کلکی دەخاتە ناو گەڵیو چاو بازنەییەکانی بە شەپۆلێ قازیقولنگو ماسیگردی زیتنەوە هەلدەواسیت • تۆ چاو دەنووقێنیو چاو دەکەیتەوە •

•

تابلۆی سێیەم :

فاتە بە کراسە چیتە ئاڵو سوخمە تویکلە پیازییەکەیەوە پێشوازیت دەکات • شێرە پەلاماری لاقت دەداتو تۆش پەلی بۆ درێژ دەکەیتو چەند جارێك هەڵیدەدەیتە حەواو دەیگریتەوە ، گۆنای نـازەش ڕادەمووسی • لەو بەرەوەتان ، تۆڕەوانەکەی ئاشنات وا تۆڕو سەوڵو کەرەستەکانی لـە کۆڵ دادەگرێو بزەیەکت لە ڕوویـا بۆ دەکێشێو بە دەسـتو بـازووە مسییەکەشی سڵاوت بۆ ڕەوانە دەکات • ئەویش ( مـاهوودە ) کە وەکـو سێبەری سەگێکی دڵسۆز پێوەی لکاوە ! بیر دەکەیتەوە • «سەگ لێرەو ئەوێ هەر سووکو ڕیسوایە ! » •

— بابە ! ئەو خڕانە چی بوون بە سەر شانی باوکی ماهوودەوە !؟

فاتە پێش تۆ دەکەوێ :— کوڕم ماسییان پێدەگرێت • خـۆت پـێ ناگیریو دەمی شاردزایی دەکەیتەوە :

— ئەوانە خڕۆکەی قوڕقۆشمن بۆ ئـەوەی تۆڕەکە قـورس بێـتو ڕۆ بچێتە خوار •

ناتەوێ بەولاوە تریان لەلا بدرکێنیو باس لە قوولایـی ژێـر ئـاو بکەیت — وەکو شارییەکە ئاگادار تانی کرد — ئەوەك زیرەیان بچێ ؛ بەلام خۆت وا شەوی ژێر ئەو زۆنگاوەت لێوە دیارە • ئەختەبووتو جلە حەوت سەرییەکان دەبینی کە پەلە شلە مژەرەکانیان — وەکو شارییەکە ووتی — بۆ هەر لایەك دەێرن • «خڕۆکە قوڕقۆشمینەکانی تۆڕەوانیش لە مشتی ئەو

ئەختەبووتو جلە نەگریسانە قوتار نابێ !! » دڵت دەگوشرێ • خێزانەکەت لە ئامێز دەگری‌و لە چەشنی تاڵە بسکی خۆرنشین ، بە کاوە خۆیی دەخزێنە ناو کونجەکەتانەوە ، بۆ ئەوەی پێکەوە لەگەڵ مانگەشەودا بنوون‌و لەگەڵ گزنگدا پێکەوە ڕاپەڕن • چونکە تۆ لەگەڵ هەیاسەکانی تر دا تێکەڵاوی خشت‌و خۆڵ‌و ئاو دەبیت «شەوی مێشولەیی واش بووە کە خەووم زڕاوەو گوێم بۆ پاشکۆی لاوکێك هەڵخستووە ، یان بەیتێکی قــۆچ عوسمـــان شەونخوونی کردووم قۆچ عوسمان دەرێ خولا خراکا ماڵە شەیتان‌و شمری دەنا بەکارە • ئەنگۆ چل کەس دەگەڵ ئەمن بکەن مەرج‌و قەرارە • بگرنەوە مراوییەکی باڵ کوورو دەگەڵ بازێکی خاسە تەوارە •• »

مانگە شەوی رابردووت هەرگیز لە بیر ناچێت کە شێرە سرنجی هەورە زیوینەکانی دەدا :

— بابە •• بابە ، تو خوا ئەو هەورانە بە ئەسپ‌و ماین ناکەن !؟

زەخمەکەی دڵت کولایەوە «ئەسپ‌و ماین هەر چەندە سوار چاکیـــان دەوێ بەڵام ، هەوری پڕ حەوت ئاسمانیش بە گوێـــرەی تنۆکێـــك ئـــاو تینووتیم ناشکێنێ » تەنیا وەرامت ئەوە بوو کە توند لە باوەشت گـــرت‌و چاوەکانت پڕ بوون لە فرمێسك ، ئەگینا دەمێکە هەر وەکو چـــاووت بـــە ئاوێکی تەلیسماوی شۆردرابن ، شتەکان بە جۆرێکی دیکە دەبینی • دوورتر دەبینی • قووڵتر دەبینی • بەرین‌تر دەبینی • «باوکی ماهوودیش ئێمـــە ئاسایی ، هەژارێکی ڕەنجدەرە ، هەموو چەوساوەین ، وا هێڵ‌و نیگارەکانی شارییەکەم لە پێش چاوە کە ئەو دەمە وامدەزانی گوێزم بۆ دەژمێرێ »•••

دەی ••• سبەینێ ئێوارەش وەك هەر ئێوارانێك ، مەلەو سناوێك دەکەیت‌و

لە شێوەی زیندەوەرێکی ئاوەکیو بەلەسە ، ڕوو لــە شــۆرەکاتی ڕۆخو بۆدڕی زۆنگاوەکە دەکەیتەوە • هیواو چاوەڕوانی لە مۆختدا وەکو دوو کەڵەکێوی . دەکەونە نەبەردو زۆرانبازییەکی خوێنین ••• ئەوســاکە بــە دەنگی بڵند بە خۆت دەڵێیتەوە «نەخۆشییەکە لە خۆمانە •• لە خۆمان••»

**حوزەیرانی ١٩٨٠**

# دوو چیرۆکی زۆر کورت

## ١ـ پـاسکیل

ئەم نهۆم و ئەو نهۆمی ئاپارتمانەکەیان پێکرد • پێچەڵ پێچی پەیژەکان برستیـان لێبـڕی • تـووکـو نـەفرەتی لە خوای شەڕو تاریکی کرد • لای قژ خورمایەکەوە لەنگەری بەست • ئەم ناوی (کاکە) نەبوو ، بەلام ئەو شۆخە قژ خورماییە بە ئاوازێکی ئەوتۆ دەیووت ، بە جۆرێك حـەزی کرد باوکی وای ناو نابایە ، ئەمجارە ئافەرینی بۆ ئەدیسۆن ڕەوانە کردو ••• دەمارەکانی شل بوون وەکو کەسێك جووتێ ڤالیۆمی پێنجی قووت دابێ ، بەلام ، پەنجە ڕندو خرپنەکان چێکەکەیان بۆ (کاکە) نووسی ، کاکەش تیلی چاوێکی لاساری بە خەفاوکەکەیەوە شۆڕ کردە فاو کراسە قۆپچە هەمیشـە ترازاوەکەی • هەستی بە برسییەتییەکی ناکاوی کرد ! نەوسی بۆ ژەمێـك تکاو مری بۆ هەمبەرگەرێکی سەر پێیی خۆش کرد • کاکە نەیزانی ئارایشی دەستکردو بۆیەی تەفرەدەر چۆن تابلۆیەکی لە پێش چاوی ڕازاندەوە !! ملی شینە شاهۆی دی • بەژنی عەرعەری دی • چاوی مانـگا کێـویشی ، تەنانەت ، لە لای ئەو لەش و لارە دەرپەڕیوە دۆزییـەوە • دیسـان ، بـۆ خوارەوە • تەزبیحێك نەحلەت • جارێکی دی بۆ سەرەوە • هەزارو یـەك ئافەرین •••

بۆ دواپین جار لەگەڵ پەیژەکاندا ، تێکەڵاوی زەوی بوو•ئۆخەی•••لە

سیلەی ئاپارتمانەکەوە لای کردەوە • شەقامە سیخناخەکە لە ئامێزی گرت • لای بانقێك وەستا • ناوی بانقەکەی خوێندەوە • چــووە ژوورەوە ، لــە ژوورەوە ؛ چاوەڕوانیو جانتای ئاووس لەگەڵ ئیشی پاژنەکەی ، چاویان ئەبڵەق کرد• ژمێریارەکە پێنج دینارەکەی دایێ، ئەم شەرمی بە خۆی هات• لە دەرەوە ، لای کۆگایەك ، پینج دیناری تریشی لە گیرفانی خۆی هاویشتە سەریو بە خۆشی خۆشی پاسکیلە سێ پاچکەکەی هەڵگرت •

هەر بەدەم ڕێگاوەش بە خۆی گوت :

ــ هاسان نییە مرۆڤ بتوانێ چرکەیەك لە ژیانی خۆی ڕاو بکاتو لە چوار چێوەی ووشەدا بیگریت •

★ ★ ★

## ٢ــ پەڵەیەکی چڵــکن

ئەوڕۆژە ، لە رۆژنامەیەکدا نووسرابوو کە : [منداڵێــك لە برسانــا مردووە ] خۆ ئەگەر خاوەن رۆژنامەکە بام ، شەقازللەیــەکم دەسرەوانــدە بناگوێی ئەم هەواڵنوسە ••• دەمگوت :

ــ ڕۆڵە تاکە منداڵێکی چی ! وا بە بەتالیۆن دەیانمرێنن •

خۆ ئەگەر بهاتبایە وەرام :

ــ باشە لە کوێ !؟

دەمگوت : سەرنجی نەخشەی زەوی بدەو لە هەر جێگایەك پەڵەیەکی چڵکنت دی ئا لەوێ •••

ــ وەکو !

ـ وەکو •• وەکو •• دیارە کوێری ، ئەو گشت پەڵە چڵکنانە نادینی !
باشە وەکو ئێرە ••

کە سەر بڵند دەکاتەوە ، پەنجەم لە سەر جێگایەك دەبینێ ، پەنجەم هەندە بە نەخشەکەوە توندە وەك بمەوێ لەو پەڵەیەوە کونی بکەم •• ئەمە هەمووی خەیاڵی پلاوە ، ئەگینا ، •• هیچ •• خۆ نە من خاوەن رۆژنامەم و نە کەسیش بە کڵاوی من رۆشنایی دەپێوێ •

**شوبــاتی ١٩٨١**

# پێڕست

من مطبوعات المجمع العلمي العراقي
« الهيئة الكردية »

# كان هناك شخص يسمى بـــارام

قصص قصــيرة
« باللغة الكردية »

تاليف
عبدالله السراج

( ٤٠٠ ) دانه لەم کتێبه لەچاپدراوه

له کتێبخانەی نیشتمانیدا ژماره ( ٨٤٤ )ی ساڵی ١٩٨٢ی دراوەتێ

مطبعة المجمع العلمي العراقي
بغـــداد ـ ١٩٨٢